# نامەی



# ڕۆڵپەروەری


نووسینی

محمد بالیسانی

إمام و خطیب جامع حسن البارح - بغداد



بغداد ١٩٧٧

## (( نامەی ڕۆڵە پەروەری ))

## بەناوی خودای بەخشندەو میهرەبان

بەناوی خودای گــەورەو میهرەبـــان
بەڕێوە بــەری زەوی و ئاســـــمان
ســوپاس هەر بۆ تۆ ئــەی پەروەردگار
خۆ ســوتایشـــت نایێتــە ئەژمـــار
بڕێژە ڕەحمەت وەك هەوری بەهار
ســەر خۆشــەویستت پەسندە کردار
واتــە موحەممەد چـــرای ڕونـــاکی
وێنــەی بێ وێنـــە لـــە پاکیو چاکی
ســەر ماڵو منال هــەم کەسو کـــاری
سەر گشت هاودەمو ڕەووشـــتو یاری
ئەڵێ موحەممەد خەڵکی بالیســـــــان
کوڕی شـــێخ طاها دانـــایی چـــازان
لە باسی ئایین ئەنوســـــم چەنـد دێـــڕ
لە بۆ موســـوڵمان پڕ ســـودەو بەخێر
بە تایبەتی بۆ ڕۆڵــەی شـــــــیرینم
مـــەولانـــا خـــالیـــد ئـــاواتی ژینـــم
بۆیە نـــاوم نـــا ڕۆڵـــە پـــەروەری
خوا بیپارێزێو بیدا ڕەهبـــەری

## ﴾ پێشەکی ﴿

ئەندامی ئایین سێنە بزانە
ئیمانو ئیسلام سێیەم ئیحسانە
ئیمان باوەڕی کردن بە چەند شت
ئیسلام گرتنی ڕێگەی خوا پەرست
ئیحسان هەڵسانە بەفەرمانی خوا
هەروەك بیبینی بێ پێچو پەنا
گەر تۆ نەیبینی ئەوتۆ ئەبینێ
لە گشت کردەوەت وێنە ئەستێنێ(١)

ساپلەی ئیحسان بەرزو بە نازە
هەرکەس پێی بگات زۆر سەرفرازە

## بەندی یەکەم

## باسی باوەڕ [ ایمان ] ئەکات

ئیمان شەش بەشە گەر یەك لەو شەشە
نەبێ گیانە کەم مرۆ بێ بەشە

---

(١) ئەمە ئەنواڕێ بۆ فەرمایشی پێغەمەر درودی خوای لە سەر بێ کە ئەفەرموێت
« الاحسان أن تعبد الله كأنك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك ».
نوسەر

جا بۆت ئەژمێرم شـــەش بەشی ئیمان.
پێی ئەڵێن ڕوکن چی عـەرەب زوبـان

یەکــەم بـاوەڕی بـە زاتی یـەزدان
هەربەوە خاوەن هێزو هــەم فەرمـان

خــودا کە قورئـــان پێی ئەڵێ «الله»
زاتێـکی تاکـە بێ کـەسو هـەم تـا

هەر بووە هەر ئەبێ هەرگیز نامری
ئادەمیزادو فریشـــــــتەو پـەری

دروستی کردون تــا بی پەرســـتن
زیندو شــیان ئەکــات لە پاشی مردن

هەر کەس بە گوێرەی کردەوەو ڕەفتــار
سـزاو پاداشـی بۆ ئـەدا بڕیـار

دەســکردەی ئەوە گیانـە بێ گومــان
ئاســـمانو زەویو کێوو بیـابـان

مانگو ڕۆژو شەو ئەستێرەی وەك گوڵ
هــەواوو ئـاوو ئاگرو هـــەم گڵ

دارو درەختو بــەردو گیــــان دار
فریشـتەو پـەریو ئـادەمیو باڵدار

دەعبـاو دڕنـدەو مێشو مێرولــە
ماسیو ئەژدەهـا فیـلو پێشـــولە

بە کورتی هــەر چی هەیە لـە دونیــا
دەسکردەی ئەوە بزرو ئاشـــــکرا

هـەر چی کـە هەبوەو هەیە یـا ئەبێ
بـە فەرمـانی خـوا بـووە یـا ئەبێ

ئەو ڕۆزیـدەرە بۆ گشـت گیان لەبەر
لە ووشكو لـە تەڕ لـە ژورو لـەدەر

لـە خوارو لە سـەر لەم لاوو لـەو لا
لـە ڕۆژ هـەڵاتو یا خـو ڕۆژ ئـاوا

زانا بە هەر شـت هیچ لێی گوم نـابێ
بچوکترین شـت لێی پەنهـان نابێ

میرولـەی ناو چاڵ ئەسـتێرەی هـەوا
وەك یـەك ئـەبینێ بێ پێچو پـەنـا

بێ دایكو باوکە بێ ئەهـلو فرزەنـد
بێ خوشكو برا بێ کـەسو مانـەنـد

لـە هیچ شت نەبووە هیچ شت لەو نابێ
هیچ شت هاو شـانو وێنەی ئەو نابێ

ناخواو نـاخـەوێ بوژانی نی‌یـە
دانیشتنو ڕۆیین هەڵسـانی نی‌یە

درێژیو کورتی پانیو ئەسـتوری
گرانیو سـوکی بەرزیو قوری

چاوو گوێو دەم دەستو پێو زمـان
سەرو زگو پشت لوتو ڕوو ددان

بە ژنو هـەم تەنو ئەو لاوو ئـەم لا
هیچیـان ناوترێن دەر بـارەی خـودا

هـەر چی ووترابێ بۆ خـوا لـە وانـە
لەوەی کـە ئێمە هـەمـانـە جیـانە

بە کورتی هەر شت هۆی نوقســانیـە
لــە خـودا دورەو بۆ خــودا نی‌یـە

هەر چی نیشـــانە بۆ بەرزی‌و پـاکی
بـۆ خــــودا بڵێ بـە بێ غـەمنـاکی

زۆر باش بزانــە کـــە ئـەو خودایـە
لـە هەمو شـــتێك لێمە جیـــایـــە

ئەبێ وەها بێ بڕوابیت بـە خـوا
بالێت تێـك نـەدا مرۆیی گـومڕا

## باسی سیفاتی خودای بەرزو بێ هەم تا

گیانە حەوت سـیفەت هەنـە بۆ خـودا
هــەر بوینـەو ئەبێ لێ‌ی نابێ جـودا

«حەیات» زیندەگی هەم « سەمعە » بیستن
« عیلمە » زانینە « بەصــــەرە » دیتن

« قودرەت » توانا « تەکەللوم » ووتن
« ئیرادە » مـەیلی کـــردن‌و نـەکـردن

بە وانــە حـەوت ناو ئـەبێ بۆ خـودا
بۆت ئەڵێم یەك یەك بـە ئیزنی خـودا

« حەییە » زیندووە « سـەمیعە » ئەبیێ
بێ گوێ‌و « بەصیرە » بێ چـاو ئەبینێ

« عالمــه » زانــاو « قــادر » تــه‌وانــا
« موته‌كه‌لليمه » گوفتـــاری جوانـــه
« موريده » ئه‌كــات ئاره‌زوی فه‌رمــان
زۆری لێ ناكرێت لــه كارو فه‌رمـــان
ئه‌و حه‌وت سـيفه‌ته‌ی خـودا بنــاغــه‌ن
جا ســيفاتی تر گشـــتی لــه وانــه‌ن
مراندن ژياندن يــا ڕۆزه به‌خشـــين
په‌ستو گه‌ش كردن يا ته‌ڵخو شــيرين
گشـــتيان په‌يوه‌ندی ئيراده‌و قودره‌ت
ته‌واو بو باسی خوداوو ســــــيفه‌ت
خولاســـه هه‌ر شــت له كرده‌وه‌ی خوا
له‌و حه‌وت سيفه‌ته‌ی خوا ئه‌بن پــه‌يــدا
ئه‌و حه‌وت سيفه‌ته ســيفاتی زاتن
باقی ســـيفاتی فيعلی خوداتن

# بەندی دووەم

## باسی بەشی دووەم لە بەشەکانی ئیمان ئەکات

بەشی دووەمیــــان بـاوەڕی کردن
کـــە خێلێك هەنــە بێ گومــان کردن
مــەلائکەیــە نــاویــان لــە قورئــان
واتە فریشـــتە بە زوبــانی کــوردان
زۆر تر لە هەر شـــت نە نێرن نـــە مێن
خـــاوەن لەشی تەنك وەك با نا بینرێن
ئەتوانن بچنە ســەر وێنەی هەر شــت
جگە لە وێنــەی پیسو بەد ڕەووشـــت
هیچ گوناه ناکەن فەرمانبەری خـــوان
جێ بەجێ ئەکــەن فەرمان بێ ووچـان
گشـــتیان لـــە نوری دروســـت کراوون
هـــەر چین بۆ کارێ تەرخان کراوون
هەر چەند لـــە زوری ژمـــارە ناکرێن
بەڵام هــەنــدێکیان ئەبێ بنـاســرێن
چواریان هەڵــگری عەرشــی ڕەحمانن
دویان نوســەری کــاری بــەنــدانن
ئەو دو نوســەرە لــە سەر گشت شانن
ڕەقیبو عەتیــد گیــانــە نــاویــانن

عەتید لە ڕاستە چاکە ئەنوسێت
ڕەقیب لە سەر چەپ بەدی ئەنوسێت

جوبریل هێنەرە بۆ وەحیو فەرمان
تەتەرە لە بەین خواو پێغەمبەران

ئیسرافیلە بای لە دەستەو باران
لە دەست میکائیل وا ئەکرێ بەیان

عیزرائیل ئیشی کێشانی گیانە
چەند فریشتەی دی لە ژێر دەستانە

ڕیضوان کلیلی بەهەشتی لە دەست
مالیك کلیلی دۆزەخی لە دەست

مونکەرو نەکیر لە پاشی مردن
دێنە ناو گۆڕی بۆ پرسیار کردن

ئەڵێن ئەی بەندە هەستە بزانە
خودای تۆ کێیە بیدە نیشانە

پێغەمەرت کێ ئایینت چیە
پێشەوات کێیە یا قیبلەت چیە

خوشكو برای تۆ کێ بون لە دونیا
گەر وەلام بدا بڵێ بە ووریا

الله خودامە تاكو تەنیایە
پێغەمبەر أحمد هەم موستەفایە

پێشەوام قورئان ئایینم ئیسلام
قیبلەم کەعبەیە خانەیی خودام

چی موسـلمانە لـە ژنو لـە پیـاو
خوشك‌و برامن ناسراو نـە ناسـراو
وازی لێ دێنن زۆر بەدڵخۆشـی
لە سـەری لاچێت ترسی ناخۆشی
ئـەگـەر بشی بێت چـاکـە لـە کردار
گۆڕی ئـەبێتـە بـاغچـەوو گوڵزار
گەر گونـاهبـارە ئێش‌و زار ئەخـوات
تا چڵکی گوناه لـە دەرون ئەشـوات
مەگـەر ببەخشـێ خودا گوناهی
ئەو سـا نامێنێ هیچ غـەم‌و ئـاهی
بـەڵام گـەر نـەدا وەڵام بـەم جۆرە
هـاوار لـە بۆ خـۆی ئـازاری زۆرە
گۆڕی ئەبێتـە چـاڵی جـەهـەنـەم
لـە ڕۆژی سـەـزاش ئەچتە جەهەننەم
لە ئاگرو سـوتان قەت قورتار نابێت
هـەتـا هەتـایـە هیچ ڕزگـار نابێت
نـامرێت تـاکـو لـە ئـازار دەرچی
ژیـانی خـۆشیش نـابینێ هیچی(١)

(١) ئەمە مانای فەرمودەی خوایە کە ئەفەرموێت « انه من يأت ربه مجرما فان له جهنم لا يموت فيها ولا يحيى » ٠

هەر کەس بە گوێرەی وەڵام لــە دونیــا
نـــــەژی نــا توانێ کـــــــە وەڵام بــدا
گەر وەك بولبولیش وەڵام کــاتــە بــەر
چون لــە وێ درۆ نامێنێ یەکســـــــــەر
جا ســـەختە سزای مرۆی بێ بڕوا
خوایە نەمان کەی وێڵو هەم گومڕا

## بەندی سێیەم

## باسی بەشی سێیەم لە بەشەکانی ئیمان ئەکات

بەشی سێیەمیان باوەڕی هێنان
کە چەند کتێبێك هاتون لە ئاسمان
لە خزمەت خواوە بۆ پێغەمبەران
تا پێی دیار کەن ڕێگە بۆ ژیان
بەدیو چاکەوو خواریو ڕاستی
هەم پێی دیار کەن ڕێی خوا پەرستی
ئەبوزەڕ فەرموی کە سەدو چوارن
چواریان بە کتێب ژمارە کراون
یەکەم تەوراتە بۆ موسا دووەم
ئینجیلە لە بۆ عیسایی مەریەم
سێیەم زەبورە هات لە بۆ داوود
چوارەم قورئانە بۆ شاهی پڕ سود
واتە محمد شای پێغەمبەران
پێشەوای ڕۆژی ئاخری زەمان
سەدیشیان سوحوف واتە لاپەڕە
هەر لاپەڕەیێ پڕ لە گەوهەرە
دە پەڕ بۆ ئادەم پەنجا لە بۆ شیث
دە بۆ ئیبراهیم سی لە بۆ ئیدریس

بەڵام بە ســـافی هــەر قورئــان ماوە
تەورات‌و ئینجیل وەك خــۆ نەمــاوە
دەستیان لێ خســتووە پاپاوو خاخام
بــە کەیفی خۆیـــان گۆڕیوە تەمـــام
نــەم بیســـتوە لاپەڕ لە هیچ جێ مابن
ئەگـــــــەر بش مابن ڕەنگە گۆڕڕابن
جگە لە قورئــان ئیش بــە هــەر کتیب
بکرێت بەتــاڵــە ئــەی گیــانی نەجیب
چـــونکە هەمویـــان وەلا نــراون
واتــە بــە قورئــان نەســــخ کراون
بەڵام هەمویان لــە پێش داڕاســت بون
فەرمانی خوداو جێگەی ســـوپاس بون
بەڵام ئەوێســـتا ئیش بەوان نەمــا
بەڵــکو قورئــانــە ڕێگەو ڕەهنومــا
ئەوەیــە بیرو بڕوای موســــوڵمان
چون وا ئەفەرموێت خودا لــە قورئــان

## بەندی چوارەم

## باسی بەشی چوارەم لە بەشەکانی ئیمان ئەکات

باوەڕی کردن بەشـــی چوارەمین
بە پێغەمبەران ڕابەرانی دین
کە گشتیان ڕاستن ڕابەری خودان
پاكو ڕاست گوفتار دورن لە بوختان
هەندێ زانایان ئەیان کەن ژمار
ئەڵێن سەدو بیست لەگەڵ چوار هەزار
بەڵام بە ڕاستی دیار نی‌یە ژمارە
ئەوەی ووتراوە هەر ووتەی زارە
ئەوەندە ڕاستە پێغەمبەر زۆرن
هەمویان پاکن لە گوناه دورن
یەکەمیان ئادەم ئەحمەد ئاخری
بەو قەپات کرا ڕێی پێغەمبەری
پێنجیان زۆر گەورەن بە لای خوداوە
بە ئولول عەزم ناویان براوە
نوحو ئیبراهیم موساو عیسا
لە گشتیان زلتر ئەحمەد موستەفا
ئەوەی کە ناویان لە قورئان هەیە
لە سورەی ئەنعام گیانە هەژدەیە

نوحو ئیبراهیم ئیسحاقو یەعقوب
داوود سولەیمان یوسفو ئەییوب
زەکەریا یەحیا هارونو موسا
ئیلیاس ئیلیەسەع یونسو عیسا
ئیسماعیلو لوط جگە لە مانە
ناوی حەوتی تر وا لە قورئانە
صالحو شوعەیب ئادەم ئیدریس هود
ذولکیفلو ئەحمەد سەروەری پڕ سود
ئیتر هەر کەسێ کە ناوی هێنرا
بە پێغەمبەری مەڵێ ئایا نا
مەڵێ ئا هەوە مەگەر هەو نەبێت
مەڵێ نا مەگەر توشی هەڵە بیت
جگە لەو کەسان کە باش ئەزانی
هەو نینە وەکو مزدەكو مانی
شاهی ذولقەرنەین لوقمانی حەکیم
لە گەورەیی وان مەکە لامو جیم
بونو نەبونی پێغەمبەری وان
دیار نەکراوە لە شەرعو قورئان
هەر کەس بۆی ووترا « أوحینا لە »
مەیکە پێغەمبەر بە هەڵە مەچو
چون مێش هەنگوینیش ئەمەی بۆ ووترا
کەسیش پێی ناڵێت پێغەمبەر برا

هیچ ژنێك نەبووە بێتە پێغەمبەر
سا قورئان وەها پێت ئەدا خەبەر(١)

لە گوناە پاکن هەمو پێغەمبەر
هەر وا فریشتەش پاکن بێ کەدەر

هەرچی کە بیستت دەر حەق بەوانە
لە قسەو چیرۆك درۆو بوختانە

گەر لە حەدیثە یا لە قورئانە
بە مانایێکە لێمە پەنهانە

خوایە بە پاکی گشت پێغەمبەران
دورمان کەی لە گشت گوناهو خەمان

لاخەی لە سەرمان سێبەری کافر
بۆمان پارێزی ئایینو باوەڕ

سەرمان خەی بەسەر دوژمنانی دین
پێمان ببەخشە پلەی بەرزی ژین

لە ژێر چەپۆکی ئیستیعمار دەرچین
بۆمان ئازاد کە خاکو هەم ئایین

---

(١) ئەڕوانێ بۆ ئەم ئایەتە کە ئەفەرموێت « وما أرسلنا من قبلك الا رجالا نوحي اليهم » ٠

## بەندی پێنجەم

## باسی بەشی ئێنجەم لە بەشەکانی ئیمان ئەکات

پێنجەم باوەڕی بــە ڕۆژی حەشـــــری
واتــە گیــان لەبەر گشت زیندو ئەکری
گشت ڕا ئەگیرێن لــە دەشتی مەحشــەر
ئەهێننە بــەر چــاو پەرتوكو دەفتــەر
چاکــەو خراپــە گشت پیشــان ئەدرێت
گەورە یــا بچوك بۆت ژمــار ئــەکرێت
هیچ شـــت گوم نابێت لــە کردەی مرۆ
فلیمی ژیـــان دێتـــــەوە بــــەر ڕوو
هــەر کەس دان نە نێت بە بەدیــەکانی
شـــــایەتی ئــەدەن ئەندامــەکانی
گشـــت دێنە گوفتــار بە ئەمری خـودا
چی کردویانە ئەکەن ئاشـــــکرا(١)
چاکــەو خراپــە بــەرامبەر ئەکرێت
کەمیو زۆریان ئەنــدازە ئەکــرێت

---

(١) ئەڕوانێ بۆ ئەم ئایە تە « حتى اذا جاؤها شهد عليهم سمعهم وأبصارهم وجلودهم بما كانوا يعملون وقالوا لجلودهم لم شهدتم علينا قالوا انطقنا الله الذي أنطق كل شيء » ٠

گەر هەندەی یەك بن بی دەردی گیـــان
ئەچیتە بە هەشــــــت بە بێ ئێش‌و ژان
گەر چاکەی زۆر تر باشتر خۆش بەختە
ئەگەر خراپەی زۆر ترە ســـــــــەختە
بــە پێی خراپــەی زێـدە لـە چاکـە
لـە ناو دۆزەخی پەســــت‌و غەمناکـە
تاکـو پاك ئەبێت جـا ئەبی ڕزگـــار
ئەو ســا ئەچێتە بەهەشـــــت‌و گوڵزار
مەگەر ببەخشـــــێ خـودا گونـاهی
ئـەو کـات نامێنێ هیچ ئـاخ‌و ئـاهی
ئـەوە بۆ مـرۆی خــاوەن بڕوایـــە
مــرۆی بێ بـڕوا چـاکـەی گومڕایـە
چــاکـــەی کافــران پاداشی نی‌یـە
چونکو ڕەســـــــیدی پاداشی نی‌یە
ڕەســــــیدی پاداش پەیرەوی‌و بڕوا
بــەڕێو ڕەووشـــتی خەتم الانبیـا
پاداشـــــــی کافر بەس لـە دونیایە
لـە ڕۆژی دی‌کە بێ ســـودو ســـایە
بۆیـە تـا ئەبـەد جێــگەی ئـاگـرە
ئەوەیە ســزای هــەرچی کــافـرە
کــافـر یانی چی هـــەر کەسێ بڕوا
نەینی بـە خودا یـا ڕۆژی ســـــەزا

یا بە محمد یا پێغەمبەران
یا بە کتێبان یا بە فریشتان
خولاسە هەرچی لە قورئان دایە
بڕوای پێ نەکا کافرەو کومڕایە
ئەوەیە بڕوای چی موسڵمانە
هەم فەرمودەیی خوا لە قورئانە

## « باسی بەهەشتو دۆزەخ »

بەهەشت زۆر خۆشە باسی ناکرێ
هەر چەند باسی کەی هەرگیز نابڕێ
هەر چی کە بە دڵ بکەی ئارەزو
دێتە بەر دەمت گیانە زو بە زو
بۆ ئەو ژیانە کۆشش پێویستە
بۆ هەر کەس کەسە یا خاوەن هەستە
ئەو ژینە خۆشە ئەدرێ بە ئینسان
بە هۆی پەیڕەوی ئایینو قورئان
هەر کەس لا بدا لە ڕێگەی ئایین
بە گوێرەی لادان دور ئەبێ لەو ژین
ژینی بێ مردن بێ دەردو غەمی
بێ ئێشو ئازار بێ کورتیو کەمی
بێ سەرماو گەرما بێ جەنگو کینی
برسیەتیو ڕوتی لەوێ نامینی

هەر چی خۆشـیە ئامادەو بەردەسـت
چی ناخۆشـیە لەوێ نیتی هەسـت

خوا بمان داتێ ئەو ژینـە خۆشـە
گەر چی کەم بەشین لە نرخ‌و تۆشە
دۆزەخ تـا بڵێی هەندە نا خۆشـە
ئاگری گـەرم هەر دەم بە جۆشـە
ئاگری ئیمڕۆ یـەکـە لـە حەفتـا
بەرامبەر ئاگری دۆزەخ‌و ئەو سـا
قورئـان بخوێنە ئـەو جـا ئەزانی
دۆزەخ چلـۆنـە ئـازارو ژانی
بۆ ئەو کەسـانەی کـە ئەچنە نـاوی
ئەو جـا بسڕەوە فرمێسـکی چـاوی
تەوبـە کـە مەگـەر بچیـە ئـەو جێگە
زوبـە بگۆڕە گـەر خـوارە ڕێگە
ڕۆکـە لە ڕێگەی ئەحمـەدی موختـار
لە قورئـان وەگرە ڕەووشـت‌و ڕەفتار

هـەر ئەوە ڕێگەی ڕزگـاری گشـتی
هەم بۆ گشت لافاو هەر ئەوە کەشـتی

## بەندی شەشەم

## باسی بەشی شەشەم لە بەشەکانی ئیمان ئەکات

بەشی شەشەمیان باوەڕی هێنان
بە قەزاو قەدەر گیانە بێ گومان
چاکەو خراپە قازانجو زیان
هەبونو نەبون گشت بە دەست خودان
قەزاوو قەدەر چی‌یە مانایان
باشی وەرگرە خۆت مەکە نەزان
بە وێنە ئەڵێم باشی تێ بگە
لەمەش زیاتر باسی لێ مەکە
هەر کەس کە خانو دروست ئەکاتن
پێشان خەریتەی نەخش ئەکاتن
پاشان بە گوێرەی خەریتە دەستی
پێ ئەکاو ئەیکا بێ کەمو کورتی
قەزا خەریتەی کاری خودایە
قەدەر هاتنەدی چۆنی دانایە
خودا لە ئەزەل نەخشەی گشت ڕوداو
کێشاوە تاکو دونیا بێ تەواو
ئەمەیە قەزا ، قەدەر هاتنە ڕوی
هەر کار بە گوێرەی نەخشەی ڕابوردوی

ئەش توانێ لادا لەو نەخشە خودا
بۆیە کار ئەکا دەرمانو دوعا
ئەویش یەکێکە لە نەخشەی ئەزەل
باشی وەربگرە بێ کێشەو جەدەل
جا بۆیە ئەڵێن قەزا قەدیمە
قەدەر حادیثە کاری عەلیمە
هەم قەزا کوللی ، جوزئیە قەدەر
جار جار لە کوللی جوزئی ئەچێتە دەر
جا بەمە ئەڵێن عادەت دڕاندن
لە کاتی بەرجۆو(۱) کەرامەت نواندن
گیانە وەهایە بەڵام بزانە
ئەم باسە جێگەی هەڵەی دڵانە
زۆر لێ وورد مەبە باشی تێ ناگەین
کردەوەی خودا ڕێگەی بۆ نا بەین
باش بڕوا بکە بەپێی کردەوە
مرۆ ئەگیرێت فەرمانی ئەوە
بۆچیو لە بەر چی لە فەرمان مەکە
خوا خۆی ئەزانێ بیری لێ مەکە
هەر کەس لە هەرشت بکاتن ووردی
هیچی تێ ناگا عومری با بردی

---

(۱) بەرجو واتە موعجیزە . [ دانەر ]

هەر وەك کــە دوکتۆر دەرمانێکت ئــەدا
بۆچیو لــە بۆچیت نیــیە ئــەی بــرا
ئــەگــــەر بلێتن مــن زگت ئــەدڕم
یــا دەســتت یــا پات لــە بنی ئــەبڕم
هیچ ناڵێی بۆچی تەســلیمی تــەواو
لــە فەرمــانی خواش وەهــا بکە چــاو
چون خوا لــە دوکتــور زۆر زانــا ترە
ڕەخنــە لە کــاری پیشـــــەی کافرە
سود بۆ ئەو کەســە ڕو لــە فەرمان کات
لە پاشـــە ڕۆژی ئــەو جا تێ دەگــات

ئــەوا تەواو بو ئیمانو باســـی
ئەو جا پێویســـتە ئیســـلام بناسی

## بەندی حەوتەم

## باسی ئیســــلام ئەکات

ئیســـــلام گرتنی ڕێگەی خودایــــە
گیـانــە پێنج بەشـــی بۆ دانـدرایـە
ئــەو پێنج بەشـانەت بۆ ئەکەم دیــار
باشـــــی تێ بگەو پێی بکــە ڕەفتــار
یەکــەم ووشـــەیی شـــەهادە بێژی
پوختــە مــانــاشی لــە دڵ بنێــژی
( أشـــهد ) ئــەدەم شـــــایەتی بە دڵ
بە زوبانیش ئەڵێم هەر وەکـو بولبـول
( أن لا الــه ) هیــچ خــــودا نینـــە
لـــە بـۆ پەرستن کــەس ڕەوا نینــە
( الا الله ) جــگە لـــــە زاتی یــەزدان
دانەری زەوی‌و ڕاگری ئاســـــــمان
( أشـــهد ) هەم سـا ئەدەم شـــایەتی
( أن محمـــــداً ) واتــە موحــەمــەدی
کوڕی عبدالله ( رســــــــــول الله )
نێردراوی خوایــە بۆ ڕەوشەن ڕاهی
بۆ پیشـــــان دانی دەستوری خودا
بە ســـــەریا بڕژی درودی خــودا

## بەندی هەشتەم

## باسی بەشی دووەم لە پێنج بەشی ئیسلام ئەکات

بەشـــی دووەمیـــان کردنی نوێژان
گیانــە پێنج نوێژن لــە هــەمو ڕۆژان
صوبحو هەم ظوهرو عەصرو هەم مەغریب
پێنجەمین عیشـــا بــە ڕیزو تەرتیب
واتــە بــەیــانیو نیورۆو ئیـــوارە
شـــێوان خەوتنان بــەم جۆرە ژمــارە
دو ڕەکــەعــەتــە نوێــژی بەیــانی
نوێژی شـــــێوان سێ ئەبێ بزانی
نیو ڕۆو ئێوارەو خەوتنـــان چوار چوار
باش بەجێ بێنــە نوێژەکـــان ئەی یـــار
ئــەو پێنج نوێژانــە لــە هەمو ڕۆژان
لە سەر هەموکەس فەرزن بێ گومـــــان
جا مرۆی نوێــژ کــەر پیرۆزو پاکـــە
بــەلام نوێــژ نەکــەر دورە لــە چاکــە
نوێژکـــەر لە خزمەت خوا خۆشەویستە
نوێژ نەکەر ڕۆژی قیـــامەت پەســـــتە
لە دونیا سزای نوێژ نەکەر کوشتن
لــە ڕۆژی ســەزاش ئاگرو ســوتن

## باسی شەرتەکانی نوێژان

بۆ هەمو نوێژان چەند مەرجیک هەنە
بێ ئەو مەرجانە نوێژ بێ فایدەنە
یەکەمین مەرجە گیانە لەش پاکی
گشت بەرگت پاك بێ لەگەڵ جێ پاکی
ئەبێ نوێژ ببێ ئەو جا نوێژ بکەی
لە کاتی نییەت ڕو لە قیبلە کەی
ڕۆ وەرنەگێڕیت تاکو دەر ئەچیت
لە نوێژ ، ئەگەرنا نوێژت تێك ئەچیت
دەست نوێژت هەبێ گەربەبێ دەستنوێژ
نوێژ کەی بەتاڵەو بێسودە ئەو نوێژ
ئەبێ عەورەتت داپۆشی جوان
لە ناوك تا چۆك لە بۆ پیاوان
بۆ ژن هەمو لەش بەس دەمو چاوی
لەگەڵ دو دەستی تۆ بکە ئاوی

## باسی دەست نوێژ

دەست نوێژ نییەتەو شوتنی دەمو چاو
دو دەست تا هەنیشك بشۆرە تەواو
دەستت بە تەڕی بە سەر دا بێنە
دو پات تا گویزینگ پاك بشۆرینە

بێ کەمو کورتی ئـەوەیە دەسـت نوێژ
جا ئەڵێم ئەوەی ئەشکێنێ دەسـت نوێژ
هەر چی بێتە دەر لـە پێش‌و لـە پـاش
دەسـت نوێژ ئەشکێنێ بزانە زۆر باش
گەر لــە شــی مرۆ لـە ژن بکەوێت
هەر جێگایێ بێ دەست نوێژ ئەشکێنێت
ڕۆیینی ژیرو دەسـت لـە عەورەت دان
لە پێش‌و لــە پاش هی خۆتو بیــان
شەشەمیان ئیتر گیانــە خەوتنە
بێ خۆ توند کردن لە جێگەو بنــە

## باسی کورت‌و کۆ کردنی نوێژ

بۆ مرۆی ڕێبوار دروســتە کورت کـا
نیوەڕۆو عەصر هەم نوێژی عیشــــا
واتە هەر یەکەی دو ڕەکعەت ئـەکـەی
تەحیات ئەخوێنی‌و ســەلامت ئەدەی
بەیانی‌و مەغریب گیانە کورت ناکرێن
واتە ئەو هەر دوو ، ئەم هەر سێك ئەکرێن
هەروا عیشــاوو مەغریب کۆ ئەکرێن
نیوەڕۆو عەصریش پاش‌و پێش ئەخرێن
واتە مەغریبی ببــە گـەڵ عیشــــا
یا لەگەڵ مەغریب جێ بێنــە عیشــــا

هەم نوێژی نیوڕۆ ببە گەڵ عەصـــــر
یا خو بێنە گەڵ نیوەڕۆ عـــەصــــــــر
نوێژی بەیـانی هــەر لەجێی خۆیـــە
هەر وەك كورت ناكرێ هەر وا بێ كۆیە
مەرجــە ســـــــەفەرت دو ڕۆژە ڕێ بێ
بە ڕەوتی كـــاروان نە وەك هی پێ بێ
ئەوەیە ڕێگەی شـێخی شـــافیعی
بۆ ڕێــگەی تریش نی‌یـــە مـــانیعی

## باسی نوێژی سوننەتو فەرزی كیفایە

چەند نوێژی تر هەن پڕ سودو مایـــەن
ســـــونتەتن یـــا خو فەرزی كیفایەن
ســـــوننەت هەر شـــتێك كردنی چاكـــە
گونـــاه لــە تــەركی هیچ نی‌یە كاكــە
ئەو جا ســــــونتەتە نوێژی دو جەژنـــان
نوێژی ڕۆژ گیران یـــا خو مانگ گیران
نوێژی بارانــەو نوێژی چێشـــتەنگاو
لە پێش گشت فەرزێك دو ڕەكعەت تەواو
لە پاشی عیشـــــــاو نیوەڕۆو مەغریب
دو ڕەكعــەتی تر هــەنــە بــە تەرتیب
نوێژی تەراویح مـــانگی ڕەمـــــەزان
هەم نوێژی وەترە پاش نوێژی خەوتنان

## باسی نوێژی مردو

فەرزی کیفـایـە نـوێـژی مردووە
لە سـەر کۆمـەڵی ماوەو زینـدووە
بـەڵام گـەر یەکێـك بیکا لا ئـەچێت
لە سـەر هەمویان ئەو ئەگـا بـە پیت
با بۆت بەیان کەم ئـەو نوێژە گیـانـە
چون زۆر پێویستەو زۆریش ئاسانە
مردو درێژ کـە لە پاشی شـــۆرین
ڕوی لـە قیبلەوو سـەرشتی خـاوێن
بە داپوشراوی بە شـتێکی خـاوێن
گەر کفنی کرابێ نایوێ دا پۆشـین
راوەستە لە ڕاسـت سـینەی بفـەرمو
ئەکەم بۆ خودا نوێـژ لـە سـەر مردو
دەسـت بڵند کــە بێژە بێ کینـە
( الله أكبر ) دانێ سـەر سـینە
بخوێنـە ( الحمد ) لـە پاشـی ئـامین
دو بارە دو دەسـت بڵند کـە بێ کین
( الله أكـبر ) ببێـژەوە دو بـــار
صـەڵاوەت لێـدە لـە شـاهی موختـار
پاشان هەم دەسـت بەرز کەو بڵێ
( الله أكبر ) هـــەم ســـا دابنێ

لـه سـەر سـینەو دوعـا بخوێنـه
لـه بۆ مردووەکـه بـه دڵی بێ گینـه
پاشـان بەرزکه دەسـتت بفەرمو
( الله أكبر ) وەك جـاری پێشـو
دانێ سـەر سـینەو جا بـده سـڵاو
له ڕاسـتو له چەپ نوێژت بو تەواو
به کورتی گیـانـه چوار جـاران بڵی
( الله أكبر ) بێ کـەمو کـەلی
لـه دوایی یەکـەم خوێندنی ( الحمد )
له پاشی دووەم صـەلات له ئەحمەد
لـه پاشـی سـێیەم دوعـا بۆ مردو
لـه پاشی چوارەم سـەلام زو بەزو
بەس ئەوەندەیه چیـدی کـه نییه
سەجدەو ڕکوعی هیچ تێـدا نییه

## ﴿ باسی تەیەممومی ﴾

وتمان بۆ گشت نوێژ دەست نوێژ پێویسته
گەر ئاو دەسـت نه کەوت تێموم دروسـته
دو دەسـتت ئەدەی لـه شـتێ توز دار
بـه دەمو چـاوت دا بێنـه یـەك جـار
دوباره دو دەسـت بـدەوه لـه خـاك
چـەپـەت بـه ڕاسـته دا بێنـه زۆر چاك

پاشانیش ڕاسته دابێنه بە چەپ
ئیتر تەواو بو مەسحی ڕاستو چەپ
تێمومت تەواو بۆ پا هیچ نییە
هەم مەسحی سەریش لێرەدا نییە
هەروا با بکا تێموم برینداز
گەر ئاو زیانە بۆ جێگەی زامدار
واتە ئەشواتن هەمو جێگەی ساغ
جا تێموم ئەکا بۆ جێگەی ناساغ
هەم لە بەر ساردی ئاوو هەم هەوا
مرو دروستە کە تێموم بکا
جا لە بۆ غوسڵیش ئێموم بەس هەندە
پێی ناوێ کە خۆی لە خاکی وەردا

## باسی خۆ شوشتن « غسل »

هەر کات گەینە یەك دو جێگەی بڕاو
یا خود چووە ژور تا جێگەی بڕاو
هینت لە هەر کون چ پێش و چ پاش
لە هەر زیندویەك بزانە زۆر باش
واجبە هەمو لەشی خۆت بشۆی
نە وەك لەش پیسی ، بە هەڵە نەڕۆی
هەم گەر بێتەوە ئاوت بە هەر شت
ئەبێ بشۆری گیانە گشت لەشت

ژنیش هەروەها گــــەر لێی چووە ژور
ئەندازەی ووتمان گیانە بە هــەر جۆر

ئەبێ خۆی بشــوا هــەم بە هاتنی ئــاو
هەم کــە نیفــاس‌و حەیزی بو تــەواو

واجبی غوســـــــڵی کەمن واتــە دون
نیەتی بینن گشـــت لەشــو بشــــون

گەر ئاو دەست نەکەوت یا لە ئاو ترسای
تێمومێ ئەکەی چون ووتمان ئەو ســای

## باسی ئەو شتانە کە لە سەر بێ دەست نوێژو لەش پیس قەدەغەن

گەر بێ دەست نوێژ بوی نابێ نوێژ بکەی
نابێ دەستیشـــــت لــە قورئــان بــدەی

قورئان هەڵ مەگرەو تەوافیش مــەکــە
هــەم بە لەش پیســی ئــەم چوارەمەکە

نابێ لـــــە بەریش قورئــان بخــوێنی
هیچ کات لە مزگـــەوت نــابێ بمێنی

ژنیش لــە حەیزو لــە کاتی نیفـــاس
وەك لەش پیس وایە لەگشت دەنگ‌و باس

هــەم بۆ جیماعیش ڕێگەی شــو نــەدا
چونکە حــەرامــە جیماع لــەو دەمــدا

هــەم نــابی بگریت ڕۆژوی ڕەمــەزان
نوێژ قەزا نا کات ، قەزا کات ڕۆژوان

# بەندی نۆیەمین

## باسی بەشی سێیەم لە بەشەکانی ئیسلام ئەکات

بەشی سێیەمیان گیانە کەم زەکات
گومڕایە هەر کەس زەکاتی نەدات
هەر کەس ماڵی بێ پارە یان پێ ڕۆ
یا دانە وێڵە ، ژن بێ یان مرۆ
هەم مێوژو خورما ماڵی تیجارەت
لە هەر شتێك بێت خاکیش بێ بابەت
خودا داینـاوە بۆ ژینی هەژار
بەشێك دەر بکەی بە گوێرەی بڕیار
لە پارە چل یەك لە خەرمان دەیەك
لە مێوژو خورماش ئەدرێتن دەیەك
ئەو جا لە پێرۆش بەم جۆرە ئەدرێت
یەك یەك وەك لەدوا بۆت بەیان ئەکرێت

## زەکاتی مەڕو بزن

لە مەڕو بزن لە چلا یەك سەر
لە سەدو بیستو یەکەمدا دوسەر
لە دوسەدو یەك ئەبێ بەسێ سەر
پاشان لە هەر سەد دەر ئەکەی یەك سەر

## ❀ زەکاتی ووشتر ❀

له پێنج ووشتران مەڕێك یا بزنێـــك
له دەیــان دووان گیـانــه ڕێك‌و پێك

له پانــزه ســێیان لــه بیســتی چواره
له بیست‌و پێنجیــان حوشتری یەك ساره

له سی‌و شـــەشـــان یەكی دو ســـالّی
له چل‌و شـــەشـــدا یەكی سێ ســـالّی

له شەســـت‌و یەكا یەكی چوار ســـالّی
له حەفتاو شەشان دویی دو ســـــالّی

له نەوەدو یەك دویی سێ ســـــــالّی
له سەدو بیست‌و یەك سێ‌ی سێ ســالّی

پاشان له هەر چل یەكی دو ســـــاری
یا له هەر پەنجا یەكی سێ ســـاری(۱)

بەو جۆره ئەدرێت زەكاتی ووشتر
ئیتر نــایــەوێت بـۆت بلّـێم پتر

## ❀ زەكاتی ڕەشه وولاّغ «مانگاو گاڕەش» ❀

له ڕەشـــــــه وولاّغ تــا نەگــاته سی
زەكـــاتی نی‌یه گـــەر لێم ئـەپـرسی

---

(۱) سارو سالّ به دوانزه مانگ ئەلّێن ، ســـار زاراوەی كۆیەو هەولێره ، سالّ زاراوەی سولەیمانی‌یه ، جا هەردوم بەكار هێنان تا هیچیان زیز نەبن ٠

یەکی یـەك سـاڵە لە سی ببەخشـــە
لە سی تێ پەڕ بو بەم جۆرە نەخشـــە

لە گشت سی یەك ساڵ یا لە گشت چل سەر
دو ســـاڵێ دەرکە دەرئەچیت لە شــەر

## ﴿ زەکاتی ماڵی سەودایی « ماڵی تیجارەت » ﴾

ســاڵ بە ســاڵ ئەبێ ماڵی تیجـارە
لێـك بدرێتـەوە بـــە نـرخی پـارە

چل یەکی دەرکەی بیدەی بەو کەسـان
کــە خوا لە قورئان دەباتن نـاویـان

زەکـاتی هــەر شـت بەس لـە بۆ وانە
فەرمانی خوایــە وا لــە قورئـانـە(٢)

لــە بۆ غەیری وان زەکـات یاســاغە
بـدرێتن پێ یــان شـێخ بێ یا ئـاغـا

## ﴿ باسی ئەو کەسانە کە خوا زەکاتی بۆ داناون ﴾

یەکــەمـین فەقـیر ئـەوەیـە
لە دە پێویســـتان سـێیـانی هــەیـە

دووەم مســــکینە ئەو حەوتی هەبێ
کۆکــەری زەکات هــەر جۆرێك ببێ(٣)

---

(٢) ئەنواڕێ بۆ ئەم ئایەتە « انما الصـــدقات للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم والغارمين وفي الرقاب وفي سبيل الله وابن السبيل » ٠

(٣) یانی با دەوڵەمەندیش بێت ٠ [ دانەر ]

چوارەمین قەرزار پێنجەمین بـەنـدە
پێی ئەکرێو ئەکرێت ئازاد لەو بەندە

شـــەشـــەمین لـە بۆ پەیوەندی دلان
بۆ رێگەی ئیســـلام پەیرەوی قورئان

حەوتەم بۆ ئەو کـەس والە غـەزایـــە
یان بۆ هەر شـــتێك لە رێگەی خوایـە

وەك رێ خۆش کردن هـەلـکەندنی بیر
لە جێـگەی بێ ئـاو خـەلـك بکا تێر

پرد دروست کردن بنیـایی مـزگـەوت
کفنو گۆر کردنی مرۆیی بێ دەســـت

هەشـــتەم رێبوارێ نەمـاوە خەرجی
پێی ئـەدرێت تاکـو ئـەگـاتن بەجی

جا ئەبێ زەکات بکرێ بەهەشـــت بەش
بەســەر ئەو هەشـــتە بکرێتن دابـەش

نابێ گشت زەکات بەصـــینفێ بدرێت
بەلکە هەر صینفێ هەشتیەکی ئەدرێت

گەر صینفێك نەمـا بەشی ئـەو کاکـە
بەســـەر وانی تر دابەش کـە چاکـە

گیـانـە جـا ئیمرۆ زەکـــات نادرێت
ئەگـەریش بدرێت بە خواری ئەدرێت

چونکو نا گاتە دەســـت ئەهلی زەکـات
جـا ئێستە زەکات بـە فیرۆ ئـەروات

وا چاکە گشت جێ کۆمەڵێ ڕێك خەن
لە چەند کەسانی خاوەن دین و فەن
ئەوان زەکاتی ئەو جێگە کۆ کەن
گشتی لە یەك جێ کۆمەڵ و ڕۆکەن
پاشان دابەش کەن وەك موچەو بەرات
بە سەر ئەو کەسان بۆی ئەشێ زەکات
گەر ئەو کۆمەڵەش باش ئیشی نەکرد
هەڵسن بیگۆڕن زۆر بەدەست و برد
ئەوەندەم نوسی چونکو ئاسانە
باشی تێ بگەو باشی بزانە
ماڵ زێدە ئەبێ بە دانی زەکات
( یمحق الربا یُربی الصدقات )
مرۆی زەکات دەر جێگەی بەهەشتە
دوعای بۆ ئەکەن چاك و فریشتە
چاکەی ئەنوسرێ یەکی بە حەوت سەد
زیاتریش ئەبێ بە لوتفی صەمەد
نە دانی زەکات گەلێ گوناهە
خۆ زەکات نەدەر زۆر ڕو سیاهە
کوشتنی فەرزە وێنەی کافرە
چونکو لە زوربەی گوناە زل ترە
هەم ڕۆژی سەزاش ماڵی سور ئەکرێت
ئەندامی لەشی بەوی داغ ئەکرێت
وەها ئەفەرموێت خودا لە قورئان
ئەوەندە بەسە لە بۆ موسوڵمان

# باسی زەکاتی سەر فیترە

هەر وەك لە ماڵدا زەکـات واجبـه
لـە جیـاتی سـەریش زەکـات واجبـه
پێی ئەڵێن فیترە عـارفـەی ڕەمـەزان
کـە ڕۆژ ئـاوابو لـە سـەر موسوڵمان
واجبـه فیترە بـداتـه هـەژار
تـا ڕۆژی جێـژنـه ببێ بەختیـار
لـە ڕۆژی خۆشـی دڵی نەیێشـێ
لە بەر دەست کورتی خەفەت نەچێشێ
وەك خەڵك ئـەویش بەرگ‌و خواردنی
لـەو ڕۆژە باش بێ بێ خەم خواردنی
لە بری هەر سەرێك هی خۆت‌و هەر کەس
لە سـەرتە خەرجی‌و خۆراکی ئەو کەس
ئەبێ ببـەخشـی دو کیلۆو نیـو
لـە خۆراکی شـار بە نان‌و بە شـیو
بدەی بـەو کەسـان کە بۆت باس کـرا
بۆ ئەو هەشت سینفەی بۆ زەکات ووترا
ئـەوەی کـە ئەدری بۆ فیتـرە ئـەبێ
لـە قـەرزو خانوو خواردن زیـادە بێ
زیادە بێ لە گشـت پیویسـتی ماڵت
مەسـرەفی جێژنـه بۆ خۆو منـالت

هـەژار بانـەدا فیترەی ڕەمـــەزان
پێی نـالێ بـــدە جـگە لـــە نـەزان
ئەگـەر هەژاریش ســـەر فیترە بـدا
ئەدی کێ وەرگرێ ســـــەر فیترە برا
ئەوەی لـە ســـەریە کـە فیترە بـدا
فیترەی پێ ناشـێ لـە شـــەرعی خودا
ســـەر چاکردنەوەو هانێ بیـدەمن
گشـــــت فڕو فێڵە مەیکە گیـانی من
ئەگـەر لە ســەرتە گەنم یـا پـارە(١)
بنێرە مـــالی کەســـێ هـــەژارە
ئەگـەر خۆ نیتـە بۆ چی وا ئـەکـەی
گاڵتە بە دینو شـەرعی خوا ئـەکـەی
لەســـــەرت نییەو ئەو حیلەش مەکە
گوێشت بۆ نـەزان چیـــدی شل مەکە

---

(١) پارە بە پێی مەزهەبی حەنەفی ئەدرێ . [دانەر]

## بەندی دەیەمین

## باسی بەشی چوارەم لە بەشەکانی ئیسلام ئەکات

بەشی چوارەمیان ڕۆژوی ڕەمـــــەزان
ڕۆژو لا ئـەبـا ژەنگی ســــەر دڵان
هەر کــەس نەگرێتن توشی ســــەزایە
جگە لـەو کەســـــەی ڕێگەی درایـە
وەك خـاوەن حـەیـزو نیفاس‌و زكدار
شیردەرو نەخۆش هــــەم پیرۆ ڕێبــوار
ئیش‌کەر هەلئەستێ پاشـــــیو ئەخواتن
نیـەتیش دێنێ ئـــەو جـا ئـەڕواتـن
کەینی تــەنگاو بو دەبـا بشــــکێنی
وەهـا دەر ئەچیت لــــە ڕێی بێ دینی
گشتیان قەزایان واجبـە لـە ســــەر
بەڵام چی پیرە بەس فیدیەی لە ســـــەر
چەند ڕۆژوت خواردون هەندە دوجــارە
هــەژاری تێرکــــە یــا بیـدێ پــارە
هــەر نەخۆشێکیش نـەی مـابێ چـارە
ئەویش وەك پیرە ســـــــالەم بڕیـارە
ڕۆژو ئەشــکێنێ خواردنـــەوەو خواردن
یا ئیشی پیاوان لــە گـــەڵ ژن کــردن

هەرچی بچێتە ناو زك‌و دەماغ
به هەر کونێك‌دا تۆ بیکه یاساغ
جگه لە خواردن‌و خواردنەوەو جیماع
بۆ ڕۆژو شکان نەکراوه ئیجماع
ڕۆژو زۆر خێره باسی ناکرێ
پاداشی ڕۆژو به کەس نادرێ
هەر خوایه ئەدا پاداشی ڕۆژو
خوا خۆی ئەفەرموێ بۆ منه ڕۆژو
هەر منیش ئەدەم سودو پاداشی
نا گا به ڕۆژو هیچ شت لە باشی
مرۆی به ڕۆژو دوجار دڵ گەشه
بێ ڕۆژوش دو جار پەست‌و ڕو ڕەشه
یەکەم هەمو ڕۆژ کە ئەکات فتار
دووەم لە قیامەت کە ئەبێ بەشدار
خوا پێمان بەخشێ کردەوەی چاکه
قسەکی دی کەت بۆ ئەکەم کاکه
گەر بکا جیماع مرۆی به ڕۆژو
فیدیەی لە سەره بیدا زو بە زو
ئەبێ بەندەیەك ئازاد بکا یان
دو مانگ به ڕۆژو بێتن بێ ووچان
گەر ناتێر بکا دوژەم شەست هەزار
یانی نیوەڕۆو ئێواره ئەی یار
لە باسی ڕۆژو جا قەڵەم وەسره
با بێینه سەر باس حەج‌و هەم عومره

## بەندی یانزەهەمین

## باسی بەشی پێنجەم لە بەشەکانی ئیسلام ئەکات

بەشـــی پێنجـەمیـان حـەجی بیت الله
واتــە زیارەتی کەعبــە ماڵی خـــــوا

گەر بە پێی ئایین حەجت کەوتە ســەر
نەیکەی گومڕاهی وبێ دینو بــەدفــەڕ

نزیکە بمریت تۆ بــە کـــافــری
فەرمانی خوایە هـــەم پێغەممەری(١)

جا باسی مەرجی حەج کەوتنە ســـــەرت
زۆرن بــزانــە بــاسو خـەبــەرت

لەمەلای زۆر چاك وەرگرە نەســـحەت
با نەخوێنـــدەوار نەتکاتن بەد بــەخت

عومرەش واجبــە وەکــو حـەج وایــە
ئەویش زیــارەتی مــاڵی خودایـــە

---

(١) ئەڕوانێ بۆ ئەم ئایەتە « ولله على الناس حج البيت من استطاع اليه سبيلا ومن كفر فان الله غني عن العالمين » وە هـــەم فەرمودەی پێغەمبەر « من ملك زادا أو راحلة تبلغه الى الحج ولــم يحج فلا عليه أن يموت يهوديا أو نصرانيا » .

## باسی فەرزەکانی حەج

بابۆت بەیان کەم کە چۆن حەج ئەکەی
باشی تێ بگە هیچ هەڵە نەکەی
فەرزی حەج شەشن ئیحرامە یەکەم
ڕاوەستان لە چیای عەرەفات دووەم
سێیەمین تەواف ، سەعی‌یە چوارەمین
لە سەفاو مەڕوە ، پێنجەم سەر تاشین
شەشەم تەرتیبە بەڵام گەر لەدو
تەوافی قدوم سەعیت کردبو
پێویستی نی‌یە دوپاتی بکەی
کاتی تەوافی ئیفاضە ئەکەی
بەس ئەبێ سەعیت پاش تەوافی بێت
فەرز یا سوننەت هەر تەوافی بێت
ئەگەر لە جیاتی تاشینی سەرت
بە مەقەس ببڕیت چەند مو لە سەرت
بەسیەتی بەڵام تاشین خێر ترە
جا کەیفی خۆتە باشی وەرگرە
بەڵام ژن نابی بتاشی سەری
بەڵکو بەمەقەس چەند موویك ئەبری

## باسی واجباته کانی حەج

واجبـاتیشی ئـەمـانـەن گشـتی
ئیحرام لـە میقـات ئەبێ ببەسـتی
دووەم کە هـاتی لـە جیـای عەرەفـە
شـەو بمێنیەوە لـە موزدەلیفـە
سێیەم حەوت بەردان باوی عەقەبـەی
گـەورە لـە پێشی نیوەڕۆی جێژنـەی
ئـەگـەر ئەو ڕەجمەت پێشی تەواف بو
دروسـتە سـەرت تاشی زو بە زو
ئەگەر تـەوافت خسـتە پێشـەوە
سـەرت بتاشـە ئـەو جـا بێرەوە
پاشی سـەر تاشـین بەرگت لە بەر کە
گشت شت حەڵاڵ بو ، پارێز لە ژن کـە
پاشی گشت ڕوکنان(٢) ژن حـەڵاڵ ئەبێ
بـا واجبـاتیش کـۆتـایی نـەبێ
واجبی پێنجەم مانـەوەی سێ شـەو
لـە شـاری مینی تـەواوو پتـەو
شەشەم هەمو ڕۆژ بیستو یەك بـەردان
باوی عەقەبان بۆ ڕەجمی شـەیتان

---

(٢) ڕوکنو فەرزیەك مانان بەڵام واجب جیایە ·
[ دانەر ]

هـەر عەقەبەیێ بەشی حـەوت بـەردە
لە چوك دەست پێکەو لە گـەورە بـەردە

گـــەر ڕۆژی دووەم پێشی ڕۆژ ئـاوا
حـاجی لـە مینـــا هـاتو گـــەڕاوە

هیچ قەیدی ناکـا ڕەجمی ڕۆژی سێش
لە ســــەری لاچێت بەبێ دەردو ئێش

واجبی ئـاخــــر تـەوافـول وەداع
یانی لـە کەعبـــە تۆ ئەکـەی وەداع

هەرچی کـە فەرزە گـەر تەرك بکرێت
گیـــانـە بـەم جۆرە چارەیی ئەکرێت

ئەگـەر ئیحرامـــە یاخـو ووقوفـە
حـەجت بـەتـالّـە پڕ ئـاخو ئـۆفـە

ئەبی ســـــالیکی دی کـە بێیـەوە
بۆ حـــەجو نابی هیـــچ بســـرێیەوە

ئەگەر خۆ حەلقە ، سـەعی‌یە یا تەواف
قـەرزاری وانـــەی بێ فێـڵو گوزاف

هەچ کاتێك ئەکـەی دڵ لـە دڵ مـەدە
تا تەواو نەکەی دەســـت لە ژن مـەدە

ئەگـــەر تەوافی وەداعت کـــردبێ
لـــە بری تـەوافی فـەرزت بۆ ئـەبێ

وەداع ئەمێنێ لـە ســـــەرت ئیتر
مـەڕێـك بکـوژەوە نـایـەوێ پتر

ئەمــە بو باســی تەرکی فــەرزەکــان
جا بۆت بەیـان کــەم تەرکی واجبــان
یەك لە واجبــــان گــەر تــەرك کــرا
گیـانــە بزانــە فیدیەت لــە ســەرە
فیدیــە لێرەدا کوشـــــتنەوەی مــەری
گــەر پارەت نەبو یاخــو بۆت نەکــری
دەڕۆژو بگــرە ســـێ یــان لــە مەککە
حەوت لــە مــاڵی خۆت هیچی کەم مەکە
فیدیەی قیران‌و تەمەتتوع هەروا
بــەم جــۆرە ئەکرێت ببە دڵنیـــا

## ﴿ باسی ئەو شتانەی کە بە ئیحرام حەرام ئەبن ﴾

بە حەج یا عومرە گەر بەستت ئیحرام
چەند شـــتی حەڵاڵ لێت ئەبن حــەرام
گــەمــە لەگــەڵ ژن یــا جیماع کردن
هەم سەرتاشــین‌و هــەم نینۆك کــردن
جل بکەیە بــەر یا ســــــەر داپۆشی
ژنیش نــابێتن کــــــە ڕوی داپوشــی
نێچیر گرتن‌و هــــەم مــارە بڕیــن
بۆن بەکــارهێنــان وەیــا دار بــڕیــن
یا گیا لە مەککە ، هــەر کەس لەمانــە
توشی یەکێ بو فیدیــەی لــە شـــــانە

بۆ غەیری جیماع بزنیٚ یا یەك مەڕ
بكوژەوە یاخو تێر كە شەش نەفەر
هەژارو ، یاخو سی ڕۆژو بگرە
خۆت لەم سێ شتە یەكێك وەرگرە
بەلاّم بۆ جیماع دورە حیسابی
بۆیە لەو نامە بۆت بەیان نابی
لە بۆ نێچیریش وێنەی بكوژەوە
یا بە نرخی ئەو خۆراك بەخشەوە
یا لەبری هەرمشت یەك ڕۆژو بگرە
جا حیسابی خۆت زۆر باش ڕابگرە

## باسی عومرە

ئەوەبو حەجو بزانە عومرە
چۆنێك ئەكرێتن باشی وەبگرە
ئیحرامو تەواف سەعیو سەرتاشین
یا چەند مو بڕین ئیتر چیدی نین
ئیحرامی عومرەش لە میقات ئەبیٚ
ئەگەر عومرەكەت پێش یا بیٚ حەج بیٚ
گەر لە پاشی حەج تۆ عومرە ئەكەی
ئەبیٚ بچیە دەر لە سنوری مەككەی
ئیحرام ببەستی ئەوجا بیٚیەوە
عومرە تەواو كەی بحەسێیەوە

## باسی ئەمە کە بەسی جور ئیحرام ئەبەسریت

کە گەییە میقات ئیحرام ئەبەستی
جا بەسێ جۆران ئیحرام ئەبەستی

ئیحرام بە عومرە یا ئیحرام بە حەج
یا بە هەردوکیان واتە عومرەو حەج
یەکەم تەمەتتوع دووەم ئیفرادە
سێیەم قیرانە لە خەڵەت لادە
مانایی ئیحرام گیانە بزانە
نیەتی عومرە یا حەج هێنانە
یاخو بۆ هەردو هەروەکو ووتمان
پێش نیەت هێنان فرێدە جلان
بە دوپەشتە ماڵ پاش نیەت هێنان
لە مل داپۆشە تاکو خوار چۆکان
ئەگەر بەس بەینی ناوكو هەم چۆکان
بپوشی بەسە ، هیچ مەکە گومان
جگە لە دەستو هەم دەمو چاوی
ژن دائەپوشێ گشت لەشو داوی

## باسی حەج بە عومرە « تەمەتتوع »

گەر بە عومرەت بەست ئەچیتە مەککە
تەوافو سەعیو سەرتاشین بکە

عومرەت تەواوبو بەرگت بکە بەر
تا روژی هەشتەم خۆش ئەبەیتە سەر
جا ڕۆژی هەشتەم لە قوناغی خۆت
بۆ حەج ببەستە ئیحرامی مەزبوت
حەج تەواو ئەکەی هەروەکو ووتمان
مەڕێ یا بزنێ بکوژە بێ ووچان
واتە پاش عومرە گیانە بکوژەوە
مەڕێ یا بزنێ هیچ لێی مەسرەوە
ئەگەر بۆت نە کڕاو یا خو نەکرا
سێ ڕۆژیان لەوی بە پوختی بکرە
حەوتیان کە هاتی لە ماڵێ بگرە
ئەوجۆرە تەواو باشی وەربگرە
گەر بۆ ئیحرامی حەج بەستن بچیە
یەك لە میقاتان ، لا ئەچی فیدیە
واتە مەکوژەوە هیچ شتو مەگرە
روژوشو ئیتر خێریشی پترە

## باسی حەجی لەگەڵ عومرە «قیران»

گەر بە هەر دوت بەست دەست بەحەج بکە
ئەعمالی حەجت گشت تەواوبکە
بۆ حەجو عومرە ئەوەندە بەستە
حەیوانێك بکوژە هیچ ڕامەوەستە

ئەگەر بۆت نەکرا بگرە دە رۆژی(١)
سێیان لە مەکەو لە ماڵ حەوت ڕۆژی
ئەگەر پیش عالفە بچیتە میقات
حاجی بێ خەمە با فدیە نەدات

## باسی حەجی تەنها « ئیفراد »

گەر بە حەجت بەست سا حەج تەواو کە
کاتێ لە مینی هاتیەوە مەککە
هەروە مزگەوتی بە ڕێز عائیشە
جا لە بۆ عومرە ئیحرام بپوشە
وەرەوە مەککە عومرە تەواو کە
جا هیچ شت نەما دڵت حەساوکە
بەو جۆرە هەروە سەفەری حەجێ
زۆر باش بزانەو باش کە جێ بەجێ
لێرەشدا فیدیەت نایێتە ملی
ئەم جوزەش خێر ترە مەکە تەمبەڵی
دوبارە ئەڵێم بە هەرسی جوران
چون ئەچی بۆ حەج ، تا نەکەی هەڵان
گەر بەحەجت بەست ئیحرام بۆ مەککە
بچو دابەزەو تەوافێك بکە

---

(١) ڕۆژی : بەمانا ڕۆژووە ، ڕۆژی زاراوەی کۆیەو هەولێرە ، ڕۆژو زاراوەی سولەیمانی یە ٠

تەواف القدوم ناویە ئەو تەواف
لە پاشان ئەکەی نوویژی تەواف
واتە دو ڕەکعەت نییە زیاتر
گەر لە مەقام بێ خێر ترەو باشتر
لە پاشان بچو سەفاوو مەروە
سەعی خۆت بکە گیانە حەوت کەرە
تا ڕۆژی عالفە وەها ئەمینی
نابی گیانە کەم ئیحرام بشکینی
لە ڕۆژی عالفە ئەچیە عارەفات
لەوێ زۆر بکە نالینو دوعات
لەوێ ئەمێنی تاکو ڕۆژ ئاوا
ئەگەڕێیەوە پاشی ڕۆژ ئاوا
بۆ موزدەلیفە شەو لەوێ ئەبی
بەیانی چونت بۆ مینا ئەبی
لەوی حەوت بەردان باوێ عەقەبە
جا سەر بتاشە هیچ مەحتەل مەبە
ئیحرامت تەواو بەرگت لە بەر کە
تا تەواف نەکەی دەخلی ژن مەکە
تا هەمو ڕوکنان نەکەی جێ بەجێ
ژن حەلاڵ نابێت لە بیرت نەچێ
لە پاشان بڕۆ بۆ مەککەی شەریف
بکە تەوافی ماڵی خوای لەطیف

ئەمە تـەوافی ئیفاضـــــەو ڕوکنە
پاشـــان بۆ شـەوێ وەرەوە مینـــــا

سێ شـــەو لەوێ بە هـەم هەمو ڕۆژان
بیستو یەك بەردان باوێ عەقـەبـان

بۆ هەر عەقەبێك کاکـە حەوت بـەردە
لە چوك دەست پێ کە لە گەورە بـەردە

گەر بەس دو شەو مای هیچ قەیدی ناکا
بەڵام پێش مەغریب وەگـــەڕێ کاکـە

ئەگەر مەغریب هـــات نـابێ دەر بچی
لە مینـــا تاکو سێ شــــــەو دەر ئەچی

کــە هــاتیـــە مـەککە بچـــو دەرەوە
ئیحرام بە عومرە بەســـتەو بێرەوە

عومرەش تەواوبو کە ویستت دەرچی
لـە مەککە لـە بـو بـەرەو مـاڵ بچی

تـــەوافی بـەیتی بـکەو بێـــرە دەر
پاش ئەو تەوافـە مەبە لـە وێنـــدەر

تەواف الوداع نـاویـە ئـەو تـەواف
لە لای سێ ئیمام واجبـە بێ خیـــلاف

ســـــا بەمە ئەڵێن حـەجی بـە ئیفراد
باشی وەربگرە ئـەگـەی بـە موراد

گەر بەهەردوت بەست وەك حەجی ئیفراد
بچۆو ئیش بکە بێ فێڵو فەســــــاد

لـــه جيـــاتی حەج‌و عومره ئـــەژمريت
ئيتر نـــايـــەوێت كـــه عومـــره بكرێت
مـــەگـــەر بـــۆ خێرو زێـــده ئـــەوابت
له بۆ خـــۆت بكەی يا دايـــك‌و بـــابت
ســـــا بـــەوه ئەڵێن حەجی بـــه قِـــران
له لايەن زۆر كەس ئەو خێر تره له وان
گەر به عومرەت بەســـت بچۆ بو مەككه
لـــــەوێ دابـــــەزەو تـــەوافی بـــكه
ئـــەوه ئـــەبێتـــه تـــەوافی عومـــــره
بـــه ويش تـــــەوافی قـــدومت كـــــرا
لـــه پاشـــــــان نوێـــژی تـــەوافی بكـــە
بڕۆ بۆ ســـــــەفا ســـــــەعيشت بكـــه
ســـەعيت تەواو كرد بتاشـــــــه ســـەرت
گشت شـــت حەڵاڵ بو بەرگت كه بەرت
تـــا ڕۆژی عالفـــه بمێنـــــه پڕ كـــــام
ڕۆژی عالفـــه ببەســـــــــته ئيحرام
بـــۆ حـــەج‌و بچۆ لـــــه بۆ عـــارەفـــات
لـــەوێ بمێنـــه تـــاكـــــو ڕۆژ ئـــاوات
لـــه موزدەليفـــه شـــــــەوت بكەوه
بـــەيـــانی لـــه بـــۆ مينـــــــا بێرەوه
ســـا بكـــه ڕەجمی عەقـــەبـــەی گـــەوره
ســـەرت بتـــاشـــــــه يـــا چەند موببڕه

جا وەرە مەکە بکە تەوافت
هەم بە جێ بێنە نوێژی تەوافت

ئەو جا تەشریف کە بکە سەعی حەج
بەمە تەواو بو عومرەتو هەم حەج

ئەگەرییێەوە مینا سێ شەوان
یا دو شەو گشت ڕۆژ ڕەجم کە شەیتان

پاشان کە ویستت بەرەو ماڵ بڕۆی
تەواف الوداع ئەکەیتو ئەڕۆی

جا بە هەر جۆرێك لەو سێ جۆرانە
حەجت کرد حەجت ڕاستو ڕەوانە

گەر بە ئیفراد بو چث ناکەوتە سەر
لە دو جۆری تر فیدیەت دێتە سەر

ئەگەر پیش عالفە نەچیە وەمیقات
ئەگەر چووی فدیە لە سەرت ئەروات

بویە کە ئیفراد خێر ترە لە وان
جا بەو ببەستەو مەکە هیچ هەلان

## باسی زیارەتی مەدینە

برام کە چویە سەفەری حەجی
لە پاش حەج کردن یا پیشی حەجی

بچۆ مەدینەی حەزرەتی سەردار
لە بو زیارەتی مەرقەدی موختار

چونکە زیارەتی قـەبری پێغەمبـەر
لە بۆ هەموو کەس پڕ سودەو بـەفـەر

هەر کـەس بکاتن زیـارەتی قـەبـری
لـە شـەفاعەتی بەشـیك وەر ئەگـری

جا ڕابوەســـتە بەرامبەر « شــوباك »
بـاش بپـاریوە بـە دلیـکی زۆر پـاك

بلّی سـەلامی خودات لەســــەر ربی
جەزاو پاداشــت زۆرو بـەفـەر بی

بو ریگەی راســـتی شارەزات کردیـن
هەر چی بـە ســوودە پیت راگەیاندین

هیچ کەموو کورتیت نە کرد لە فەرمان
دونیات رووناك کرد بە ریگەی قورئان

گەیشتیەوە خوا بـە دلیـــکی زۆر شاد
پاش تـەواو کردنی تەبلیغو أرشـــاد

هەزار ســـــەلاتو ســـەلامی خـودا
برژێت بە سەرتا تا ڕۆژی ســـــەزا

خوایـە بۆ خاتری ئـەو زاتـە پـاکـە
لێمان خوش ببـەو دلمان گوشـــــاکە

پاشـــان برو حاصــت بو بکرو عمر
ســەلامیان لێ بکە بە دلیکی زۆر تـەڕ

بلێ ئیـوە بوون وەزیـری حـەزرەت
تەقسیرو نەکرد لـە ئیشو خزمـەت

خــوا لێورازی بیت بــه پاکی ئیوەش
ئێمەش بکاتن لــه رەحمی هاوبەش
بەینی منبرو قەبــری پەیغەمبـــەر
میرگی بە هەشــتە وائەدریت خــەبــەر
جــا لــەو بەهەشـــتە دەرناچی خەستە
بێ شـــیفاو دلگەش ئەبی چی پەســتە
خویەك نوێژی مزگــەوتی رســـول
بە هەزار نــوێــژ ئەکــریتن قــەبــول
پاشـــــــان بچۆ بۆ « جنـــة البقيـــع »
گورستانیکە زۆر گەورەو وەســـیع
پــڕە لـــــە خزمو کــەسی پێغــەمبـــەر
هەم یارانی ئــەو پیــاوانی دڵتــــەر
لــە خـــوای گــەورە زۆر بپـــارێوە
بــۆ خـــوتو بــۆ وان جــا بگــەریوە

## باسی گەورەیی حەج

جا حــەج پیرۆزە حــەج گەلــەك خێرە
لە خزمەت خـــوا دا پاداشـــــی زۆرە
هەرچی، حەج بکات حەجی ڕێكو چــاك
لە گونــاه ئەبیت خاوێنو هــەم پــاك

وەکو ئـەو ڕۆژەی لـــە دایـك بووە
چڵکی گونـاهی لــە خو شوشتووە[1]

حەجی ڕاســتو ڕێك نی‌یە پاداشـــــی
جگە لە بەهەشت لــە ڕۆژی پاشـــی[2]

نیشانەی حەجی قەبولــە ئـەی جـــان
حاجی کردەوەی باشــــترە لــە پێشـــان

ئەگـــەر نادیارە حـــاجی گــــەڕاوە
بەس مـــانـدو بونی لــە کیس دامـــاوە

با بەس بێ باسی حــەجو هــەم حــاجی
خوایـــە بیخە دڵ ڕاســــــتی‌و ڕەواجی

هــەم درودی زۆر لــە ســەر پێغەمبەر
وەك باران بڕژێت تا ڕۆژی مەحشـــەر

---

(١) ئەڕوانێ بۆ ئەو فەرماییشتەی حـــەزرەت : « من حج فلم يرفث ولم يفسق خرج من ذنوبه كيوم ولدته أمه » .

(٢) ئەڕوانێ بۆ ئەو فەرماییشـــــتەی پێغەمبەر : « الحج المبرور ليس له جزاء الا الجنة » .

[ دانـــەر ]

## بەندی دوانزەهەمین

## باسی پارێز کردن لە گوناه ئەکات

ئـەوا تـەواو بو پێنج بەشی ئیسـلام
باشی وەربگرەو ڕای بگرە تەمـام

بەڵام بزانـە ئیسـلام دو ڕێـزە
کـردنی واجـب دووەم پـارێـزە

ئەوەی باسـمان کرد باسی واجب بـو
دەبـا پارێـزیش بـاس بکـەم بۆ تـو

گیـانـە پاریـزی گونـاه پێویستە
مرۆی گونـاهبار ئەنجـامی پەسـتە

هـەروەك کەسـانێ کـە دەردە دارن
توشـی نەخۆشـیو ئێشو ئـازارن

دوشت پێویستە بۆ چارەی دەردیـان
پێشـەکی پارێز دووەمین دەرمـان

دەرمان بێ پارێز سـودێکی نی یە
هەروەك بێ دەرمـان پارێز هیچ نی یە

دینیش وەهایە پارێزو دەرمـان
دەرمان واجبات ، بۆم کردی بـەیـان

پارێزیش دوری لـە هـەر گوناهـە
مرۆی گونـاه بـار خۆ ڕو سـیاهە

لــــه هــەوا بفڕێ بڕوای پێ مــەکــه
خــۆتی لێ لاده بـــرایی مـــەکــــه
گونــاه گەلێکن بۆت نــاکــەم ژمـــار
بەڵام به کورتی بۆت ئـەکــەم دیـــار
هەرچی زیـانــه بۆ گــەل یــا بۆتــاك
گونـــاهــه مەیکه ئەی گیـانی دڵ پــاك
بۆ ماڵ یــا بۆ خوێن یا ناموسی کــەس
دەست درێژ مــەکــه تا ببی بەکـــەس
به دەســـتو زوبان بــه هیچ ئەندامی
کاری وا مەکــه کــه لــــه ئـەنجـامی
بــڕەنجی دڵی ئـــادەمیـــــــــزادی
بەمه دور ئەبیت لــه هەر فەســـادی
ئەگەر ئەتەوێت ڕێگەی ڕاســت بگریت
ڕزگاریو خۆشـی دو دونیــا وەگــریت
له هەر دو جێگه بژی بــه خۆشـــــی
نەبی دوچـاری دەردو نــەخۆشـــــی
ئەوەی حــەز ناکـەیت له گەڵت بکرێت
له گەڵ کەس مەیکه ڕونەو ڕاســته ڕێت
ئەوەی حەز ئەکــەی خەڵــك بۆت بکات
بۆ خەڵــکی بکه ئـەکــەی بــه ئـاوات
ئەوەیــه ڕێــگەی حەدیثو ئـایــەت
ئیتر دو شـــــته تەقواو عیبــــادەت

یانی پارێزو هەم خوا پەرستی
هەر کامت نەبێ گیانە دڵ پەستی
بەودو خۆش ئەبێ مردنو ژیانت
خۆشەویست ئەبی لای دوشمنانت
بە ئەخلاقی چاك بەپاکی ڕەووشت
دونیا ئەبێتە گوڵزارو بەهەشت
بە خویی بەدو بە بەد ڕەووشتی
جێگەت دۆزەخە گەر لە بەهەشتی
قسەو قسەڕۆك ئەو لاوو ئەم لا
پشتی تێ بکە ڕۆکە لە « مەولا »
خوێندن گەوهەرە زانینو ئایین
هەر ئەو بە کەڵکن لە دونیاوو دین
پەندم ئەوەیە گیانە بۆ هەر کەس
بەو پەندە ناکەس ئەبێتن بە کەس
هەم ئەبێ هەمو ئیشو فەرمانت
بەپێی ئیسلام بێت ماوەی ژیانت
چونکو بۆ گشت شت ئیسلامی پڕ نور
ڕێگەی داناوە بۆ نزیكو دور
هەر لە بیشکەوە تا دەرچونی جان
بۆتی داناوە ڕێگە بۆ ژیان

هەر کەس لابدا لە ڕێگەی ئیسلام
توشی زیان ئەبێ بێ شك لە ئەنجام(١)

---

(١) ئەڕوانێ بۆ ئەم ئایەتە « ومن يبتغ غير الاسلام ديناً فلن يقبل منه وهو في الآخرة من الخاسرين » .

[ دانەر ]

## بەندی سیانزەهەمین

## باسی پێغەمبەرو ڕەوشتی پاکی ئەکات
## « درودی خوای لەسەر بێ »

لـە پاشـان گیانـە چەند شتی تر هـەن
ئەبێ بیزانن پشـتی تێ مـەکـەن
پێغەمبەری مـە نـاو موحـەممەدە
لە گشـت کرداری پـاكو پەسـندە
کـوڕی عبـدالله عبـدالمطلـب
هاشـمو عەبـدول مەنـاف بە تەرتیب
تـا ئەگـاتـە سـەر ئیبراهیم خەلیل
زنجیرەی پاکـە بـە بێ قـالو قیـل
دایـکی ئـامینـەی کچی وەهـەب بو
وێنـەیی پـاکیو ڕێـزو ئـەدەب بـو
دایـەی حەلیمەی سـەعدیەی ناوە
جا ئـەو خاتونـە شـیری پێ داوە
لـە شـاری مەککە لـە دایـك بووە
هەر لـە منالی خۆی شـیرین بووە
نە کورتو نـە درێژ وێنـە گەندومی
چـاوو بـرۆ ڕەش نـازك پەرچـەمی

دەســـت پــاكو ئـازا زیــرەكو دانــا
دور بــو لــە ڕەخنــە لای هــەمو زانــا

بێ كینەو ڕق بو خۆش ووشــەو گوفتار
فــەریــادی لاتو پــەنــاهی هــەژار

بێ نازو فیز بو هێمن لــە ســەر خۆ
بۆ ڕێگەی ڕاســتی پڕ لــە جستو جۆ

دانش لــە هــەر كــار خاوەنی چاكــە
دور لــە فــڕو فێــڵ دەمو دڵ پــاكــە

درۆو دەلەســەی لێ نەبیســـــترا بــو
لای دۆســتو دوژمن بڕوا پێ كرا بــو

پێش پێغەمبەری كــە باســیان ئەكرد
بە ڕاست گۆو ئەمین گشت ناویان ئەبرد

لە ژیرو بیری ســـودیان وەر ئــەگرت
بۆ شـــتی زۆر زل پر سیان پێ ئەكرد

وەك لابــردنی نــاكــۆكی بی حـــــەد
لە ســەر دانانی حەجەرول ئەســـــوەد

لە جێگەی خۆیــا لــە دیــواری بــەیت
هەر خێڵێ ئەیویست كە خۆی دای بنێت

خــەریك بــو جــەنگێ بكەوێتــە نــاو
گشـــــت یەكتر بكوژن بەژنو بــە پیاو

ئەو ڕێكی خســــــتن خستیە بەرمارێ
هەڵیــان گرت تاكو كــەییــە جێ وارێ

هـەركـەس لايەكی بەرمـالّی گرتبو(١)
جا خۆی هەڵی گرت داینـا لە جێی خو
کەس بێ بەش نە بو دڵیشـیان نەشـکا
پشـتی شـەیتانی بەو ئیشـە شـکا
جا بەو ڕەووشتە زۆر خۆشـەویست بو
کاتێ تەمەنی پێنج سـالّو بیست بو
لـە بەر ڕەووشـتو کرداری پـاکی
خەجیجە خواسـتی بێتە هاو تاکی
خۆی داوای لێ کرد کـە وا بی خوازی
کـە خواستی دایان زۆر بە شـانازی
گیانـە نابڕێ باسـی پێغەمبـەر
ئەگـەر بنوسرێ هەزاران دەفتـەر
خۆ فەلسـەفەی ئەو هێشتا تێ نـاگـەن
زانـایی عـالـەم ڕێگەی بۆ نـابـەن
گشت زانا لـە ڕۆژ ئاواو ڕۆژ هـەڵات
سەر سامن لە ڕێی زانسـتیو خەبات
ئـەڵێن ئـەو ڕێگەی لـە کێ هێنـاوە
ئەو خەلکە پەستەی چۆن پێ هەڵسـاوە
شـوانو گاوانی گـەیـاندە ئـەو پا
بونـە شـاهەنشـای ئاسیاو ئەوروپا

---

(١) بـەر ماڵ زاراوەی سولەیمانی‌یە ، بەرمـار زاراوەی هەولێر •
[ دانەر ]

هەرچی ووتویە گشـــــتی تەواوە
خۆ هێشـــــتا زۆریش نـە زاندراوە
لە کێی خوندووە لـــــە کی دەرچووە
لای کام فەیلەســـوف دەرسی خوندووە
نـازانن ئـەوە کـاری خـودایـــە
دەســت چینی ئەوەو خۆی ئـاوی دایـە
ڕێگەو ڕەووشــــتی چاکتر نیشـانە
کـە پەروەردەی ئـەو لە لای یەزدانـە
گیـانـە تـکایـە مێژوی ژیـــانی
باش بخوێنــەوە ئـەو جا ئـەزانی
چ شــــــەهبازێکە شـــاهی ئەنبیـا
چ ســـولتانێکە گەورەی پێشـــەوا
بەس مەڵێ خوایـە ئیتر حـــەز ئەکەی
چی ئـەڵێی بلێ کـە مەدحی ئـەکـەی
لـە بـەر پیرۆزی ئـەوەنـدەم نوســی
نەوەك نابڕێ گشـــت کەس بنوسی
خوا لامان نەدات لە ســـەر ڕێگاکـەی
زیندو شمان بکات لـە ژێر ئالا کـەی

## بەندی چواردەهەمین

## باسی بیر کردنەوەی پەیغەمبەر لە حاڵی خەڵكو چونی بۆ ئەشکەوتی حەڕاو بونی بە پێغەمبەر ئەکات

لە گەڵ خەجیجە کە بووە هاو سەرین
نەختێ سەر سوك بو لە ڕوی ئەرکی ژین
ئەو جا کەوتە بیر لە ڕێی چەوتو ڕاست
لە شتی پڕو پوچ زۆر خۆی ئەپاراست
شتی ناڕەوای لا ناشیرین بو
لە نەزانی گەل گەلێ غەمگین بو
زۆر قینی ئەهات لە بتو سەنەم
ئەیویست پاك بکا لە گشتیان حەرەم
ئەی زانی ئەمە نابن بە خودا
خودا شتێکە لە مانە جودا
تۆ خوا شتێکی بە دەست تاشا بێ
چۆن ئەبێ شاهی گەداو پاشا بێ
دڵی پڕ داخ بو لە ژیانی ئەو دەم
ژیانێکی وێڵو بێ سودو بەرهەم
بەربەرەکانی خەڵکی لە سەرماڵ
هەژار خواردنو دادیش پایە ماڵ

ئەو نازو فیزەی سـەرۆك‌و سـەردار
دونیـای تـاڵ کرد بو لـە مروی دلدار
نەزانی‌و لاتی ناکـوکی‌و پیسـی
خۆ تەندروستی کەس لێی ناپرسـی
زۆرداری چەتـره سـایەی کردووه
گەل وەکو گاگـەل لـە بن نوسـتووه
خۆ هەڵدانـەوه بە پشـت‌و نـەتـەو
بە هێزو بـە ماڵ بـە دەست‌و جەلـەو
زانـاوو زانسـت هیچ ڕیزی نەبو
خۆ داد پەرستیش هیچ نـاوی نـە بـو
بێ یاسـاو قانون هەم بێ ڕێگەو شـون
هەر کەس لە بۆ خۆی ئەمری کاف‌و نون
ئەو زاتـە هەردەم بـە مـە دڵگیر بـو
پرسـیاری هەر دەم لە جوان‌و پیر بـو
ئەڵی ئـەو گەلـە کـەی ئـارام ئەبێت
کەی بۆ ڕێگەی ڕاست دڵ بە کام ئەبێت
ئەبێ کـەی ڕیـزیـك بکەوێتـە نـاو
یاسـایی هەبێت بیگرنـە بـەر چاو
داد پەرسـتنێك سـا بۆچی نی‌یە
مێشـکی ئەم گـەلـە بۆچ وا گـەنی‌یە
ڕێگەی ئـابـوری کـۆمـەڵایـەتی
یارمـەتی و پیتـاك یـان برایـەتی

لـه بۆچی نی‌یه بێ ڕێگـه‌و شـوێنه
بـه‌دی‌و بـه‌د خویی بۆچ وا بـه تینـه
بـۆچ خوێنـده‌واری هیچ بـاوی نی‌یه
خۆپیشـه سـازی هه‌ر ناوی نی‌یه
بۆچی ئه‌بێ کـچ زینـده گۆڕ بکرێت
لـه مـاڵی بـاوکی هیچی پێ نـه‌درێت
ژن بۆ بێ به‌ش بێ لـه هـه‌مو ژیـان
جگه لـه ژیـانی په‌سـتی‌و بێ سامان
خوایه که‌ی ئه‌بێ گـه‌ل له خه‌و هه‌ستن
ده‌ستی یه‌کیه‌تی له گـه‌ڵ یه‌ك به‌سـتن
ڕێك بخـه‌ن ژینی ڕێك‌و پێـك‌و پـاك
بێنه سـه‌ر ڕێگای ڕاسـت‌و هه‌م ڕوناك
بۆ ژینی گشـتی‌و بۆ ئاسـوده‌گی
ڕێگه‌ی ئـازادی نـه‌ك هی بـه‌نـده‌گی
با سـه‌جده نـه به‌ن لـه بۆ دارو به‌رد
با داوا نـه‌کـه‌ن لـه بت خۆشـی ده‌رد
ئـایـا خـودایـه بـه چ ڕێـگایی
واز لـه مـه دێنن چـۆن دێنـه ڕایێ
چـۆن ئه‌بێ بگرن ڕێگه‌ی ڕاسـتی
ڕێی لـه بت لادان ڕێی خوا په‌رسـتی
له سـه‌ر ئه‌و بیره لـه پێش چل سـاڵی
چـووه غـاری حیرا قۆڵی هـه‌ڵ مـاڵی

بۆ خـــوا پەرســـتیو ڕێ دۆزینـەوە
دوری لە خەڵكو دڵ حەســــــــینەوە
هـەر بیری ئـەكـرد ئـەپاڕایـەوە
بـۆ ڕێـگە دۆزی ئـەنـاورایـــەوە
لــە چــل ســاڵیدا خوا وەحی بۆ نــارد
بــە جوبرائیــلدا قورئــانی بــۆ نــارد
جوبرائیــل فەرموی اقــرأ بخوێنــە
من خوێنـدەوار نیم وازم لێ بێنـە
جوبرائیل گوشیو فەرمـوی بخوێنە
بــە نــاوی خــودا هیــچ تێ مــەمێنــە
هــاتــەوە ماڵێ شـــڵەژاو شـێواو
ووتی دام پۆشــە خەجیج بە هەشـــتاو
عەرزی كرد چی بووە ســابۆی گێڕاوە
خەجیجەی هوشـــیار زۆر دڵی داوە
ووتی ڕەفتــارو خوو ڕەووشتی تۆ
دورە لــەو شــــــــتەی لێ ئەترسی تۆ
ئومێــدم وایــە ببیــە پێغـەمبـەر
لــە بۆ ئـەو گـەلـە ببی بــە رابـەر
جا بردی بۆ لای وەرەقـەی بــە نـاو
بـۆی گێـرایـەوە بـــە پوختی ڕوداو
ووتی ناموسی عیســـاو موســــــا
وا هاتۆتــە لات ســا هیچ مەترســــــە

تۆ پێغەمبەریت سـەد موژدە بۆ خۆت
خۆزگا بژی بـام کۆمـەك بکـەم بۆت
ئـەو ڕۆژەی گـەلت دەرت ئـەکـاتن
لە خاكو شـارت بێ بەش ئـەکـاتن
ووتی لـە بۆ چی گـەل دەرم ئـەکـات
ووتی هەر کەسێ داوای حـەق بکـات
ئـازار ئەبینێو لـە شـار دەر کـردن
پاشـان بەشی ئـەو هێزو سـەر کەوتن
ئەو جا ڕۆژ بـە ڕۆژ وەحی بۆ ئەهـات
دەستی کردە بانگ لە بۆ ڕێگەی ڕاست
خەڵك کـە بیستی قسـەو گوفتـاری
تەماشـایان کرد ڕێگەو ڕەفتـاری
ووتیـان ئەو ڕێگە ناگونجێ بۆمان
لێمان تێك ئـەدات دەوڵـەتو سـامان
ڕویان کردە ڕێی بـەر بـەرەکـانی
هەر کەس تێ کۆشێ بـە هەردو شـانی
هەر چەند بـە ڕێگەی زەحمەتو ئازار
بەر بەسـتیان لێ کرد بۆیان نەکرا چار
ڕۆژ بـە ڕۆژ لـە حـەق گەرمتر ئەبو
یارو دڵسـۆزی هـەر زۆر تر ئـەبـو
مامۆسـتا جوبریل خـۆ زۆر چاپوکـە
ڕۆژ بـە ڕۆژ ئەینی نامـەو پەرتوکـە

لە دژی ڕێگەو یاســـای بــەد بەختــان
حەزرەت بانگ ئەکات لە شارو دەشتان
ئــەمــەیــە ڕێگا ڕێگەتــان خــوارە
خۆ دوا شــەڕ مــەکــەن زو بکەن چارە
ویستیان بی کوژن بەلاّم مامی[1] چاك
وێســـــتا بەرامبەر دەسیسەی نا پاك
پاشــان مامەکەی ئەمری خــودای کــرد
هیزێکی گەورەی لە کیس ســەروەر برد
تینیان بۆ هێنــا جا نەیما هیچ چار
خۆوو یارانی دەرکەوتن لــە شـــــار
چونــە مەدینــە لــەوێ دامــــەزران
ســا کەوتنە خۆشیو سەر بەستی ژیــان
جا دایان مەزراند دەوڵــەتی ئیســـــلام
دەوڵەتی قورئان هــەم خودای عــەللام
لە بلاّو کردنی ئایین نــە ویســــــــتان
دادیان بلاّو کرد لــە دێو شــارســـتان
هێزیان پەیدا بو دینیــان پەرەی بەست
دوژمنان بەمە زۆر باش کردیان هەست
زۆر هەوڵیــان ئەدا لــە ناویان بــەرن
بۆیان ڕێك نە کەوت بە کچکەو مــەزن

(١) واتە أبو طالب •

ڕۆژ بە ڕۆژ خودا بەهێزی کردن
خۆ هیچ نا ترسان لە کوشتن‌و مردن
لایێ قەبائیل لایێ جولەکە
لە لایی تریش خۆ خەڵکی مەککە
گشتی دوشمن بو بۆ ئەو کۆمەلە
بۆیان دا ئەنان سەد داوو تەلە
بەڵام هەر کەسێك خودای لە گەڵ بیت
دوشمن لە هەر لا وەکو مێگەل بیت
هەر سەر ئەکەوێت ئەوڕو نا سبەی
ڕێگەی ڕاست بگرە وورەت بەر نەدەی
ئاخر سەرکەوتن لە سەر هەمو لا
گەش بو دڵی پاك بەرز بو ئاڵا
مەککە شیان داگرت بە فەرمانی حەق
بت‌و سەنەمیان کردن شەق‌و لەق
ئەوجا پیت بە پیت لە نیزیك‌و دور
خەڵك ئەهاتن بۆ شاری پڕ نور(٢)
ئیمانیان ئەینا ئەبون بە ئیسلام
بەرزو بلاو بو ئاینی ئیسلام

---

(٢) ئەڕوانێ بۆ ئەم فەرمودەیەی خوا « اذا جاء نصر الله والفتح ورأيت الناس يدخلون في دين الله أفواجاً فسبح بحمد ربك واستغفره انه كان توابا » ٠ [ دانەر ]

بە ڕێگەی ڕاستی‌و بەدادو چاکە
خەڵکیان هێنا سەر ئەو ڕێگە پاکە
بەم جۆرە دین‌و ئایین بڵاو بو
تاکو تەمەنی حەزرەت تەواو بو
لە کاتی تەمەن شەست‌و سێ ساڵە
کۆچی دوای فەرمو ئەو چەهرە ئالە
گۆڕی پیرۆزی کەوتە مەدینە
خاکی قاپی‌یەکەی دەرمانی سینە
دە ساڵ مایەوە لە مەدینەی پاك
سەری نایەوە حەزرەت لە ژێر خاك
گیانی پیرۆزی گەییشتەوە خوا
بە دڵێکی زۆر گەش کردی کۆچی دوا
خوایە دەك ئێمەش وەك ئەو دڵ گەش کەی
لە سایەی سەروەر ئێمەش هاو بەش کەی
بۆ خاتری چاك‌و پاك‌و دڵ پاکان
دورمان خەی لە ڕێ‌و شوێنی نا پاکان
لێمان نەگوری نەمان کەی بەد بەخت
قەت توشمان نە کەی ژینی تەنگ‌و سەخت
نە لەو دونیایە نە لەوی دی‌کە
بە کردەوەی چاك بن‌کەی خەریکە
برێژە هەردەم وەك باران ڕەحمەت
سەر موحەممەدو ئاڵ‌و هاو سوحبەت

## بەندی پانزەهەمین

## باسی ڕوداوی پاش وەفاتی پێغەمبەر ( د٠خ ) ئەکات

له ڕۆژی کۆچی حەزرەتی سـەردار
یاران گەلێك بون شـیواوو غەمبار
زوربەیان وەك شـیت ئەسـوڕانەوە
بـە نـاڵـەو زاری بـە گریـانەوە
عومـەر وەکـو شێر لـە مەیدانەوە
شـیری دەر هێنـا لـە کالانـەوە
هاواری ئـەکـرد ئەحمەد نـامـرێ
ئەوگوڵەسـوره هـەرگیز نـاوەرێ
هەر کەس بڵێتن مردووە پەتیە کەم
بـەم شـیرە تیژە من لەت لەتیـە کـەم
بـو بـەکر هەڵسا چووە سەر مینبـەر
سـوپاسی خوای کرد بە دڵێکی زۆر تەڕ
دای لە سـەر حەزرەت گەلی سـەلاوەت
پاشـان خوێندیەوە لەو دەم چەند ئایەت
« ما محمد » نی‌یە سـائەو شـا
کەسـیکی وابیت لە بەشـەر جیـا
« الا رسـول » بەس پەیغـەمبـەرە
بۆ ژینو مـردن ئەویش بەشـەرە

« قد خلت » ڕۆیین « من قبله » پێش ئەو
« الرسل » گەلێك پەیغەمبەر وەك ئەو
« أفان مات » ئەگەر هاتو مرد
« أو قُتِلْ » یاخو کوژراوو ڕابورد
« انقلبتم » هەڵ ئەگەڕێن یا نا
« علی » لە سەر « أعقابکم » پاژنە
یانی لە ئایین پەشیمان ئەبن
هەم لە ڕێگەی ڕاست مل پێچان ئەبن
« ومن ینقلب » هەر کەس هەڵگەری
« علی عقبیه » سەر پاژنەی دوپی
« فلن یضر » زیان ناگەینی
« الله » بە خوا یان بە ئایینی
« شیئا » هیچ شتێك لە کەمتر زیان
خۆیان لە دوا ڕۆژ ئەبن پەشیمان
« وسیجزي الله » خوا پاداش ئەدات
« الشاکرین » چی سوپاس ئەکات
لە پاشان فەرموی ئەوەی خوا ناسە :
خودا نامرێت خاوەن سوپاسە
هەرکەس موحەممەد پەرستە دەسا
موحەممەد وا مرد شیواوی بەسە
عومەر هاتەوە سەر بیرو هۆشی
ڕوی لە بەکر کرد بە ڕویکی خۆشی

ووتی گەورەیی هەر تۆ ئەزانی
من ئەو ئایەتەم بۆ چی نەزانی
دەستی بۆ بەکری گرتو ماچی کرد
ووتی سا کاتی شێواوی ڕابورد
جێ نیشێك دانیین بۆ شاهی سەردار
جێ بە جێ بکات گشت فەرمانو کار
با دابنیشێ پێمان دا فەرمان
لە فەرمانی ئەو دەر نەچین هیچمان
هەڵسانو چونە لای خێڵی ئەنسار
لە بۆ دانانی جێ نیشیی سەردار
لە پاش زۆر هەڵلاو ئەو لاوو ئەملا
بوبەکر کرا جێ نیشی ئەو شا
جاپێغەمبەریان بە خاکی سپارد
بە دلیکی گەرموو بە ئاهێکی سارد
ئەوەیە ڕێگەی گشت شاهو گەدا
ئازاوو پەستو دڵ پاكو ڕیسوا
بە چی دڵ خۆش کەین بە دونیاوو ژین
دونیا ڕێگەیە ئێمەش ڕێ ڕەوین
هیچ باکت نەبێ بە ژینی دونیا
چونکو ناخۆشیو خۆشی گشت ئەڕوا
هیچ کەس نامێنێ لە چاكو لەبەد
هەموی ئەنوێتن لە ژێر خاكو بەرد
گەر پاشە ڕۆژت پاكو ڕوناکە
خۆشیو ناخۆشی دونیا چ باکە

# بەندی شانزەهەمین

## باسی جێ نشینەکانی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

جێ نیشـــیی یـەکـەم ئەبو بەکر بو
دوهەمین فاروق شـــاهی عومەر بو
سێیەمین عوسمان چوارەمین حـەیـدەر
پێنجەمین حەسـەنِ نەوەی پەیغەمبەر
ڕیزی گـەورەییش سـا بـەم جۆرەیـە
هـەر کەس بـەم جۆرە نەڵێ کۆرەیـە
کورەیی دڵـە نـەوەك هی چـاوە
هەم فوی شـــەیتانی لـە دڵ کـراوە
دو ســـاڵو چوار مانگ بوبەکر جگە
لـە هـەژدە ڕۆژان مـاوە لـەو جێـگە
حەزرەتی عومەر شەش مانگو دە سـاڵ
داد بەو زینـدو بو سـتەم پـایـە ماڵ
حەزرەتی عوسمان دوازدە ڕۆژان کـەم
لـە دوازدە ســالان ماوە بەبێ خـەم
حەزرەتی عەلی چوار سـاڵو نۆ مانگ
کردی ئەمیری بەهەشـــت کردی بانگ
حەسەن بەس شەش مانگ کردی جێ نیشی
بـە مـەعـاویـەی بەخشـــی جێ نیشی

بۆ لا بــردنی ناکۆکی ئیســــــــلام
تا چیدی نەرژێت خوێنی گــەل بــە عام
هەزار ئافەرین هــــەزار چاکــەو خێر
بۆ شــاهی حەســــــەن ئەو مەردی دلێر
ئاشتی پەیدا کرد لــە بەینی ئیســــلام
جــەنگی برا گــوژی وەلا برد تــەمــام
بــو مەعــاویەش دامــەزرا ئیجمــاع
کــە خــەلیفــە بێت کەس نەیما نیزاع
ڕەحمەتی خودا لــە ئێمەو لــە وان
هەم هەمو کەسێك کە هەیتی ئیمان

## بەندی حەڤدەمین

## باسی ئەو کەسانە کە بە چونی بەهەشت مژدەیان پێ دراوە

دەیــــاری دڵ پــاك یــارانی حــەزرەت
مژدەیــان پێ درا کــە ئەچنــە جەننەت

بوبەکرو عومەر عوســمانو حەیدەر
عبدالرحمانی عــەوفی بــە هونــەر

تەلحــەو ســـــــەعید ئەبو عوبەیدە
سەعدیش یا خودا خۆش بن بەم موژدە

لــە بەر خاتــری وان خودایــە ئێمەش
خــاوەن بەش فەرمو گونــاهن ببەخش

ســـیرەتیان گیانــە بخوێنــەوە چاك
هەتا بیــــان ناســـی گرۆهی دڵ پــاك

بۆ چەند کەسی دیش داویەتی خــەبــەر
کــە ئەچنە بەهەشت ڕەســـولی سەروەر

جــگە لەو کــەســـەی موژدەی بۆ دابێ
پەیغەمبەر کــە وا ئەهلی ســـــەفا بێ

ســــــا بۆ کەسی تر شـــــایدی مەدە
بە بەهەشتو گووێ بە قسەی کەس مەدە

ئەنجــامی گشـــت کەس لێمە پەنهــانە
بەڵام کردەوەی چاکــە نیشـــــانــە

ئەنجامی هیچ کەس لە دەست کەس نی‌یە
بەس لە دەست خوایە هیچ گومان نی‌یە

ئەو جا ماچ مەکە هیچ دارو بەردان
مەچووە زیارەتی قەبرو مەرقەدان

لە بۆ هیچ نیاز مەگەر بۆ یادی
مردن‌و پاش مردن کزی‌و کەسادی

هەم تا بزانی دونیا وەهایە
ڕێگەی هەمو کەس لێرە کۆتایە

هەم بکەی دوعا بۆ خۆت‌و بۆ ئەو
قورئان بخوێنی خێری بدەی بەو

بەڵام هاوارو داوا لە مردو
پیشەی نەزانە هەم کاری بەد خو

چون کەس نا توانێ سود بە کەس بدا
مردو یا زیندو بە غەیری خودا

ڕوت لە خودا کە هەر لەو داوا کە
هەر چی ئەتەوێت لە سودو چاکە

کێ چی لە دەست بو لە کاتی ژیانی
لە پاشی مردن جا چی ئەتوانی

پەیغەمبەری خوا ئەفەرموی پێمان
لە دەستم نایەت هیچ سودو زیان

لە بۆ هیچ کەسێك بە غەیری دوعا
هەم پاڕانەوە لە ذاتی خودا

کە ئەو وەهابی ئیتر ئەی نەزان
چی داوا ئەکەی لە چاكو پیران
هیچ سودت نادات کیانە چاكو پیر
لە دینو دونیا نیتە دەستگیر
غەیری پەیڕەوی یا دوعای چاکە
دوعایی چاکان بۆ مرۆ چاکە
دوعایی زیندو بۆ زیندو هەیە
دوعایی مردو جێگەی قسەیە
چی موسوڵمانە لە بۆ موسوڵمان
دوعای ڕەوایە لە کاتی ژیان
جا خۆت دوعاکە چەندی ئەتوانی
هیچ کەڵکت نادەن کاظمو گەیلانی
زاتێ گەورە بون ئینکار نا کرێ
بەڵام سودی کەس بە کەس نادرێ
کرداری خۆتە ئەخۆی بەرهەمی
ئەو ڕۆ نەچێنی لاتی لەو دەمی
« یوم لا تملك نفس لنفس
شیئاً » لە مێشکت لانەچی دەرسی
« قل » بڵێ « اني لا أملك » من
لە دەستم نایەت بۆ گچکەو مەزن
« لكم » بۆ ئێوە « ضراً » هیچ زیان
« ولا رشداً » هەم قازانج پێ دان

قورئـــانو حەدیث بخوێنـــە ئـــەو جـــا
ئـــەزانی قســـــەم هەموی وەك گـــەنجە
بـــا ووشـــــکە مەلا خەلیفـــەی نەزان
مێشکت پڕ نـــەکـــەن لە درۆو بوختـــان
دین فوکـــە فوكو هـــەم گریـــان نی‌یە
هەم دین زیارەتی ســـەر قەبران نی‌یە
دیـــن دوا کــــــەوتنی ڕژێمی خـــوایـــە
خۆفیدا کردن لـــە ســـەر ئەو ڕایە
دین ئیش کردنە بۆ دونیـــا وەك شـــێر
لـــە بۆ قیـــامـــەتیش وەك مەردی دلێر
خـــاوەن کـــەڵك بی بۆ تـــاكو کۆمـــەڵ
نەك بێ‌ئیشو کار مل پـــانو تەمبـــەڵ
گریـــانو زاری پیشـــــەی ژنـــانـــە
ئەو کەس مرۆیـــە ڕوی لـــە فەرمـــانـــە
لە سەر ڕێگەی خوا ئیش کەیتو بژیت
بە بێ فوکە فوك بۆ بەهەشـــــت ئەچیت
شـــاهی نەقشـــــبەند وا ئەکـــا بەیـــان
پیری گـــەیلانیش وا ئـــەدا فـــەرمـــــان
چونکو ئەوەیـــە ڕێگەیی قورئـــان
هەم ڕێگەی شاهی کشت پەیغەمبەران

## بەندی هەژدەهەمین
## باسی ڕێگە کانی ئایین « مذاهب » ئەکات

گەر لیت بپرســـن کە مەزهەب چەنـدن
زو بلێ چوارن گشـــتیان پەســـــەندن
یەکـــەم حـــەنـــەفی مـــالیـــکی دووەم
سێیەم شـــافعی ئەحمەدی چـــوارەم
بـــە هـــەر ریگەیی لـــەم چوار ڕێگانـــە
ئیش کەی دروستە لـــە بو تو گیـــانـــە
ڕێـــگەی تریش هـــەن بـــەلام هیچیـــان
وەك ئەو چوار ڕێگە ـتو کۆ نەکران
هەمویان ڕاســـتن چون وەر گـیراون
لە سە جاوەی دین گشـــت هەلقولاوون
ســـەرچاوەی دینی حەدیثەو قورئـــان
هەرچی دەر نەقولی لەم دووە بی گومان
هیـــچو بـــەتـــالـــە بڕوای پێ مـــەکـــە
خـــۆتی لێ دور خـــە ئیشی پێ مـــەکـــە
چی لـــە قورئـــانو حـــەدیث جیـــایـــە
ئەوەی دوای کەوێت گیـــانە گومرایـــە
ئاگات لـــە خۆ بیت خۆ شـــەیتان زورن
نا حەق پەرستو هـــەم لە حـــەق دورن
هەر کەس ئەیەویت بـــە ریـــگەو جۆری
لادەی لـــــە دینت جـــالێت ـــە گـــوری

## بەندی نوزدەهەمین

## باسی تەریقەتو وەلیو شیخی تەریقەت ئەکات

کیـانـه بزانـه تەریقــەت ڕاسته
گەر بـه شـەریعەت ببێت ئاراســته
هـەر تەریقەتێك لـه شـــەرع لادا
ڕێگەی شـــەیتـانـه خۆتی لێ لادە
هەر کەس بلیتن حـال جیـایه لـه قال
تف که له چارەی موفسـیدەو دەجـال
ئەیەوێت تێك دا شـــەریعەتی خـوا
عالمیش بکات گـومـڕاو ڕیســوا
هـەر حـالی لـه قـال لابـدا گیـانـه
هەوایی نەفسو پەتی شــــەیتانه
بەمەی نـه فەرمو زاتی پەیغەمبـەر
جـگه لـه قـالو قورئـانی پڕ فەڕ[1]
هـــەر قـالـه ئـەبی ببیتن بـه حـال
نەوەك بەتالـه گشـــت حالو ئەحوال
تەریقەت دانــرا بو بـانـگی کۆمـەڵ
کـه به قورئـانو حەدیث کـەن عەمەل

(١) ئەڕوانێ بۆ ئـەم حەدیثه « اني تركت فيـكم مـا ان تمسكتم به لن تضلوا أبداً كتاب الله وسنتي » ٠
[ دانەر ]

نەك بو بانگاشـــە بو فیســـکەو فلان
بــە خەونی درۆو چیرۆکی بوختــان
بیکەن بەســەنەم هــەمــو شــت ئــەوە
هــاواری پیر کـــەو ئیتر پــاڵ کــەوە
ئەوئەت پارێــزێ لــە گشت چەلەمە
لــە دونیــاو قیــامــەت دەســگیرت ئەمە
لــە قسەی پەیغەمبەر ئیتر دور کەوتن
بــە دوای دەسیسەی ئــەم ئــەو کــەوتن
پەیغەمبەر فەرموی بــە مــامو کچی
بـــە پلكو پــوری لــە بـیرو نــەچی
من کــەڵكو نــادەم لــە خزمەت خــودا
هەر کردەوەی خۆت کــەلکت بۆ ئــەدا
جا کە پەیغەمبەر نــەدا کــەلکی کــەس
کێ کــەلــك ئەدا بۆ تۆ یــا بۆ کــەس
تاکــەی نوستووی دە هەستە لە خەو
بۆچ فریو ئەخۆی بــە قسەی ئەمو ئەو
رولــە ئــاین کــە بــە گوێرەی ئــاین
ئیشو فەرمـــان کــە ڕزگــاری یەقین
گیــانــە قــورئــانو حەدیثە ئــاین
یا بریاری گشـــــت زانایانی دین(١)

---

(١) واتە ئیجماع ٠ [ دانەر ]

ئیتر بە چی دی خۆ مەکە دڵزار
تا لە لای خودا نەبی شەرمەزار

هەر کەس کە دیتت خەڵکی لە لایە
خەریکی سوزو هەللا هەللایە

تا باش تێ نەگەی چۆنە ڕەفتاری
بڕوای پێ مەکەو مەکە هاو کاری

ئەگەر گشت کاری بە شەرع چابو
ئەو جا بزانە جێگەی بروا بو

ئەگەر نا لادە و خەڵکی لێ دورخە
بێ گومان گورگەو عالیش بەرخە

بە کورتی گیانە شەرعە تەرازو
هەر بەو بناسە مرو زو بە زو

هەر کەس بە کیشەی شەرع گرانە
ریزی لێ بگرەو قەدری بزانە

ئەوەی لە کێشی شەرع دا سوکە
گەر بفڕێ بە باڵ سوکو چروکە

## باسی چۆنیەتی وەلی

دیسان بزانە ئەولیا هەنە
ئەولیا لە لای خودا گەورەنە

ئەولیا زۆرن هەمو موسوڵمان
وەلی خودانە هیچ مەکە گومان

خودا ئەفەرموێت تـا نـە بین گـومڕاه
جـا « الا ان أولیـــــــــاء الله »
زۆر ئـاگـا داربـن ببن دڵنیـــا
هەر کەس وەلی بێ واتە دوســتی خوا
« لا خوف » ترسـیان « علیهم » لە سەر
نی یە لـە قیامـەت ئەبن بی خـەتـەر
کێنـە ئـەولیـــا « الـذیـن » وان
« آمنـوا » زور بـاش هێنـایتی ئیمان
هەم لە گـــەڵ ئیمان « وکانوا » ئەوان
« یتقون » ئەکـەن پارێز لـە گوناهان
خولاســـە هەر کەس ئیمانی هـەیـە
هەم لـە گونـاهیش پاریـزی هـەیـە
ئـــەوە وەلیـە پـلە بـــە پـلە
بـە گوێـرەی تەقــوا پلەیـان زلە
خودا ئـەزانی کـامیــــان زلتـرە
تەقـوا لـــە دڵـــداو لێمــە بزرە
پەیڕەوی شـــەرع بۆمـە نیشـــانە
بـە پێی پەیڕەوی تـەقـوا بزانـە
بـەلام لێرەدا باشـــە بناســـی
مانای ئـەو وەلیەی بلاوە باســی
ئەوەی دانیشــتیە ئەکاتن ئیرشـاد
خەڵك بانگ ئەکـات بۆ ڕێگەی مـراد

ئەو جا بۆت ئـەكـەم باسی ئـەو وەلی
تـا بـە بانگاشـــە لـە ڕێ نـە زەلی

زۆر باش بزانـە بـە ئیشو ڕەفتـار
مـرو ئـەبیتـە وەلی نـەك بـەزار

هیچ کەس بە ووجاغ نـا بیت بـە وەلی
ئەگەر لـە کـردەی چـاکـە تـەمبـەلی

گەر کوری شـاهی گشـت پەیغەمبەرە
گـەر چاکـەی نی‌یە هیچو بـەد فـەرە

گەر گوری شـوانە یا خو گـاوانـە
گـەر چاکـەی هـەیـە ڕێزی بزانە

ئەمەیە ڕێگەی شـەرعی پەیغەمبەر
فریوت نە دات هیچ کەسـك‌و مێزەر

شـیخو شێخزادە سـەیدو سەیزادە
کـرداری نەبی بـەدو بـەر بـادە

تەسبیحو سـیواك خەرقەو تەیلەسان
نیشـانەی وەلی نینە بێ گومـان

نیشـانەی وەلی دیـنو تەقـوایـە
چاکـە لـەڕێـگەی دینو دونیـایـە

فەرقی لا نی‌یە شـایا گـەدایـە
لە گەڵ هەمو کەس یەك ڕەنگ‌و سـایە

لـە بو ئیشی چـاك چاپوکـە هـەردەم
لـە بـو هـەژاران وێنـەیی حـاتـەم

لە گوناه دوربی بە شەرعی خودا
گوزەران ئەکاو ئەچیت بە ریدا
بو ئایین مل کەچ دلی‌پر خون بیت
زانا بە خوداو زانا بە دین بیت
دور لە نازو فیز ئارەزوی دونیا
لە بو ئەمو ئەو نەکا تەقەللا
لە غەیبەت دورو دور بی لە بوختان
بو خەلکی نەیبی زەحمەت‌و زیان
دەم پیس‌و جوێن دەر نەبێ روشکێن
بە حەیاو دەم خوش رو بە پێکەنین
لە گەل هەمو کەس بەبی جیاوازی
لە سەر دو پەتان نە کا ڕم بازی
لە خوا پەرستی هیچ نەیبی دریغ
بو قازانجی خەلك تیژ بی وەکو تیغ
رق‌و قینە دار کینە جو نەبیت
چاو پوش بی لە خەلك رەخنە جو نەبیت
بی بوخل‌و تەماع بێ حیقدو ریا
بێ کیبرو حەسەد خود پەسند نی‌یە
مل کەچ‌و هێمن خاوەنی بەخشین
بێ غەش‌و دلپاك گران‌و سەنگین
جیاوازی نەکا بو شاهو گەدا
بو ڕێگەی راستی هیچ نەکا پەروا

گوناهی گەورەو خو پیشاندانیش
لێی دەر نە کەویت کاتی پەنهانیش
بەلین نەشکینی پەیمان تێك نەدا
نیازی پاك بێ لە رێگەی خودا
لەگەڵ بی دینو خەڵکی ستەمکار
دۆستی نەکاتن بشی دەن ئازار
بەربەرەکانی زورداری بکا
بە دەستو زوبان هیز بە حەق بدا
هەوڵدا هەژار دەر خا لە ئازار
هەم رزگاری کا لە دەستی زۆر دار
بە پولو دراو نە خواتن فریو
بو دونیا نەکا ئەو دیوو ئەم دیو
غەزالی فەرموی تاکو بزانی
کێ راستە لە ئیش پاکە فەرمانی
گەر لەبەر نویژان ناو چەوانەکەی
شین بو یا پینەی کرد بو شانە کەی
بەرزی کرد بو لە قاچی کراس
گورج بوی مەویستە بۆی مەکە سوپاس
پولی نیشان دە ئەو جا ئەبینی
راستە یا بە درو خۆی وا ئەنوێنی
جا ئەبی بە مال دلی تیك نەچیت
لە بو تەماعی لە ری دەر نەچیت

قسەی ئایەتو حەدیثی حەزرەت
دل پڕ ئیمانو دەمی پڕ نەسحەت

بە هاونشینی دنیت زیاد بیت
روژ بە رۆژ دلت لە گوناه سارد بیت

گەر دەستت کەوی زاتێکی وەها
بە گیانو بە دڵ ببیە بە هاوڕا

ئەبی وەها بی شیخی تەریقەت
ئەگەر ئەتەوێ رێگەی حەقیقەت

نەوەك هەر کەسی دەس کا بە هەیها
سەری وەك کدو زك کوندەیی با

نە خویندەوارو لە دین بی خەبەر
خۆی کوێرە چون بوت ئەبی بە ڕابەر

کەسی کە بە خوی نەزانی ڕیگا
ئەوەی دوای کەوی ئەبیتن گومرا

بویە ئەبینین زور ئەهلی تەریق
ئاخری ئەبنە فاسقو زیندیق

چەند کومەڵ فەوتان لە رێگە دەرچون
چونکە لە عیلمو شەریعەت دور بون

جا هەر چی دیتت دل پێی مەبەستە
دەست لە سەر دەستت بوی رامەوەستە

هەر چەند بشی بیت کەرامەتی زور
گیانە بەتالە خوتی لی کەر دور

چونکو کەرامەت لە پیاوی بێ دین
فیتی شەیتانە بۆ تێک دانی دین
زۆر جار کەرامەت بێ دین ئەینوێنێ
تا دڵو بیری خەڵکی بستێنێ
بو فڕو فیلیك یا تێکدانی دین
ئاگات لە خۆت بێت لە پیاوی بێ دین
مەرجە کەرامەت لە گەل دین‌دا بیت
خاوەنی لە سەرریی ئایین‌دا بیت
ئەگەر نا گیانە کەرامەتە کەی
پەتی شەیتانە بروای پێ نەکەی
هیچ ئەو شتانە جێی بڕوا نینە
جیگەیی بڕوا کردەوەو دینە
زیندو ئەکاتن مردویی چەند ساڵ
وەك بۆن باس ئەکریت لە ئاخر دەجال
هیچ وەلیش نی‌یە بەلکە دەجالە
یانی پیس‌و بەد کردەوەو حالە
گشت زانا ئەڵێن زلتر کەرامەت
پەیرەوی شەرعە هەم ئیستیقامەت
جا باش لێکدەوە کردەوەی خەڵکی
تا باش بزانی هیچو بە کەلکی
ئەو جا هاو دەمی بکە گەر چاکە
بە هاودەمی ئەو دلت روناکە

ئەگەر نـا لادە مـەیکە دوسـتی
زۆر گورك هەنـە مـەرە پوسـتی

هیچ کەلکت نادا کـەرامـەتی کـەس
کـردەوەی خۆتـە کەلـکت ئـەدا بەس

فـەرزم شێخە کەت پر کەرامـەت بـو
ڕاستو تابعی شـەرعو ئایەت بو

تو هیچ نابینی سـود لـە حالی ئـەو
ئـەگـەر خوت نەتبی کـرداری پتـەو

کوری نوح چیـدی لـە بـەرزی باوکی
چون رو ڕەشی کرد کردەی نـا پـاکی

کە وابی کردەی خوت سـودت ئەدات
هیچ سودت نادات شـیخو کەرامـات

کردەوەش وەگرە لـە شـەرعو قورئان
جا بوچی ئەچیـە لای شـیخی نـەزان

هەر چی زانایـە لـە بو تو شـیخە
خوت وەکو تەمبەل لای کـەس مەییخـە

لـە لای نەزانیش سـود وەرنـاگیری
گـەر ئـەو نەزانـە بـە بالیش بفری

شـیعاری توبێ زانینو کـردار
جگە لـەم دووە بـوی مـەبـەر دلـزار

بـە تایبـەتی زۆر عـەیبـە بـو مـەلا
لـە خزمـەت خەلکی سـەر لەسەر ملە

مامۆستا بۆچی ئەچیە لای کەسان
ئەگەر پیت ئەڵێن خەدیثو قورئان
وا لە لای خۆتن ئیشی پێ بکە
ئیتر دەرۆزە لەمو لەو مەکە
وە گەر پیت ئەڵێن جگە لەم دووە
ئیتر بەتاڵەو خۆت لێی دوور خەوە
خوابن پاریزی لە ریگەی نەزان
بنکەی بە هاورێی سینە بێ گەردان
بە هاو دەمی وان سینەمان پاك بیت
دڵو درونمان گەشو روناك بیت
رومان بکەیە قورئانو سوننەت
واتە کردارو فەرمانی حەزرەت
ئەوی تر گشتی بێ کەلکو سودە
روو لە زانین کەن هەر ئەو بە سوودە
« وما آتاکم » چی پیتان ئەدا
« الرسول » ئەو شاهی أنبیا
« فخذوه » باش دەستی تی گرن
ئیشی پی بکەن باشی وەرگرن
« وما نهاکم عنه فانتهوا »
چی نەهی لی کرد لێی دور کەون زوو
ئەمەیە ریگەی ئایینی تەواو
ئیتر بە چی دی نابی بدری باو

هەر چی دەرچی لــەو هەموی بیــدعەتە
هەر چی بیدعــەتە هۆی ضـــەلالەتــە

وەها ئەفەرمویت پەیغەمبــەر هەزار
درودی لە سەر گەورەی گشــت سەردار

رەهبەری گشتی بۆ ری‌ی راست دەستگیر
بــو پیـــــاوو بۆژن بــو جوانو بو پیر

جا هــەر چی نەیبی پەیرەوی قورئــان
هیچ دوای مەکەوە لــە گشــت ڕابەران

چونکە هـــەر دینــە مەبــدەئی ژینــە
ئیتر کیــانــە کــەم ، خۆت مەفەوتینــە

بەو دەنگ‌و باســـان لــەو لاوو لەم لا
بانگاشــەی بۆ کەن پیــاوانی گومڕا

خو بەکری گــیراو زۆرن لـــە دونیــا
بــو لادانی خــەلك لــە ڕیــگەی خــودا

بە ووتاری خۆش بانگ ئەکەن کومەڵ
بەڵام بە ڕاستی زۆر قولــە مەســـــەل

## بەندی بیستو یەکەم

## باسی رۆژی قیامەت ئەکات

گیانە بزانــە وەك مردن راســـــتە
پرســیاری گۆڕیشن پاش مردن ڕاســتە
زینــدو بونــەوەو ژمــارەی کــردار
کردەوەی چاکــەو بــەد ئەکــرێ دیــار
بــە تەرازوویك بــاش دیــار بــدا
وێنــەی تەرازوی گــەرمــاو سەرما
لــە ڕێگەی بەهەشـــــت پردی بن ئاگر
بــاریکتر لــە مو لــە خەنجــەر تیژ تر
دەفتــەری چــاکەو خراپــەی کردار
لێ پێچانــەوەی هەر ئیشو ڕەفتـــار
هەمویان ڕاســتن هوشــت بینە ســـەر
وای بــاس فەرمووە بۆمــان پەیغەمبەر
ئــازاری نــاو گۆڕ لــە بــو کــافــران
هەم لە بۆ گوناهبـــاری موســـوڵمان
ڕاســـتە ســـابکە بڕوا بێ گومـــان
فەرمایشی خــوا وا ئــەدا نیشـــــان
هــەر کەس کافــر بی بــە پێغەمبــەری
یا خود بە خودا لــە خوشـــی بــەری

یاخـــود بـو خـــودا هــاوتـا دابنی
یا خو کــه ئــایین بــه ســــوك دابنی
ئەمانــه گشـــتیان هیچ رزگــار نابن
هیچ دەم هاو بەشـــی ناو گولزار نابن
هەر کەس کــه بادەی ئیمانی نوشـــی
ڕەوایه خـــودا گونــاهی پوشــــی
ئەوەی بمریتن لــه ســـــەر بروایی
لـــه دوزەخ نابیت هــەتــا هــەتــایی
جگه لــــه مروی بی بــەش لــه ئیمان
ئومیدی بەخشین هــەیــه لــه یــەزدان
ئەگەر گوناهی گەورەن ببەخشـــی
چاکــەی خۆیــەتی نی‌یــه هــاو بەشـی
ئــەگــەر بــه گوناهی گچــکه بن گری
دادی خویــەتی کی دەســـتی دەگــری
شەفاعەت ئەکەن گشـــت پەیغەمبەران
هەم گشت پیاو چاکی پاکی موســوڵمان
بەڵام بو کــەســی خـــاوەن بــروایــه
مروی بی بروا دوره لــەو ســـــایــه
ئەوەیــه بڕوای چی موســــــوڵمانه
هەمویـــان راستن گشت ئەو شــتانه

گـەر هەمو کەسـیکێ وەکو یەك بروا
ئەمە سـتەمەو ژیـر نـا کـا بروا[1]
ئاگات لـە خـوت بیت دل لە دل نەدەی
بەلی کولینـەوە باشـتر تی ئەگـەی
جـا بخوێنـەوە نـامـەو پەرتوکـە
کـە لەو بابـەتـە باسـت بو ئەکـا
قسـەی غەزالی وەکو شـیروایە
بو لـەت کردنی گومـان لـەو ڕایـە
خوایـە بـە چاکـەی زۆرو ڕەحمەتت
یا شـەفاعەتی گەورەی ئوممەتت
رزگارمان فەرمو روژی بـە دەهەشـت
لـە ئیش‌و ئازار پێن بەخشـە بەهەشت

## ئاگادار کردنەوەی گشت موسولمانان

گیـانـە بزانـە ئیسـلام یاسـایە
خو یاسـاییکە خـودا دای نـایـە
بـو ئـەوە مرو بـۆی بـە پێی ئـەو
لـە هیچ ئیش‌و کاردەرنـە چیتن لـەو
هـەر کـەس وابکات بـە خوشی ئەژی
لـە ورۆو لـە دوا رۆژ نـابینی کـزی

(١) ئەمە ئەنواریتە ئەم ئایەتە کە ئەفەرمویت « أفنجعـل المسلمين كالمجرمين ما لكم كيف تحكمون » ٠

هەر یاسایەکی هەبی لە زەمین
جیاوازی هەبی لە گەڵ یاسای دین
نابی موسوڵمان ئیشی پی بکات
ئەبی هەوڵدا لە ناوی ببات
چونکو ڕژیمی بەندەوو زەمین
نا گا بە ڕژیمی خودای عالەمین
هەر خوا ئەزانی چی بەدە چی چاك
باش‌و خەرابە چ پیسە چ پاك
شتی بە کەلك‌و شتی پر زیان
کاری نا پەسند یا ئیشی جوان
هەر خوا ئەزانی بو ئیمە چی‌یە
چونکە ئەو ئیمەی دروست کردیە
جا ئەو ئەزانی چ باشە بومان
شتی بە سودو شتی پر زیان
جا بەو گویرەیە یاسای داناوە
گشت شتی تیدا دیارە کراوە
ئیسلام هیچ شتی بەجی نیشتووە
بو هەمو شتی ری دا ریشتووە
بو خوت چون ئەژی یا لە گەل خیزان
یا لە گەل خزم‌و کەس‌و هەم جیران
یا لە گەل خەلکی شارو بازارت
یا لە گەل دوژمن یا لە گەل یارت

کرین فروشــــتن ئیجـارو رەهن
جەنگ‌و ئاشـتی گرتن‌و کوشـتن
بـەریوە بـردن ئـابوری کـــردن
بو تـاك‌و کومـەڵ ژیـان ریك خســتن
دادو پیك هێنان سزاوو بەخشـــین
بە ریـوە چونت لـە دونیـــاو دیـن
هەر چی پیویســتە لــە کاری ژیـــان
بو تاك‌و کومەڵ گشـــت ئەیکا بەیـان
ئیسلام ئەزانیت کـە ژیـان ریك خات
دونیـا پر خوشی‌و ئاســـایش بکـات
خەلك تی ناگـات کـە ئیســـلام چی‌یە
لە لایـان هــەر بەس نوێـژو روژی‌یە
ســەرفیترەو زەکات هەم حەج‌و ئەزکار
لـە مـە زیـاتـر دین نـا کـا دیـار
گیـانـە غـەلـــەتی کی وای پی ووتی
تف کـە لـە چـاوی بکە لـەعنـــەتی
ئـەوە شـــیعارن بو مروی ئیسلام
ئەوە پەلیکن لــــە یاســـای ئیســـلام
ئیســـلام یاسـایە ئیســلام دەستورە
ئیســــلام رژێمێ پــر دادو نــورە
ئیســلام هەر شـتیك پیویستە بو گەڵ
رونی ئەکاتن موشـــکیل ئەکـا حـەل

ئەو چارە سەری هەمو شت ئەکا
چارەی ژیان و هەم ڕەوشت ئەکا
هەر چی کە جوانە لە ئیسلامدایە
شتی ناشیرین دورە لەو سایە
بخوینە ئیسلام تی بگە چونە
ئەو جا ئەزانی گشتی درونە
ئەوەی کە ئەلین دەر بارەی ئیسلام
دوژمنانی دین یا بیژوی ئیسلام
ئەو جا واجبە ئیسلام یەك دل بن
هەمو یەك هیز و یەك شان و مل بن
لە ژێر فەرمانی پیشەوای گشتی
بو دین چەسپاندن بو داد پەرستی
تا دەستی زوردار ببڕن و هەژار
لە ژیر سیبەری بژیت بەختیار
نە یەلی کافر دەستی دریژ کات
بو داگرتنی یەك بستی وولات
پیشەواش ئەبی بە هەلبژاردن
دابنریت نە وەك بە هیز و ساندن
ئەبی لاش ببریت کە لایدا لە ری
نابی بو گشت شت بوی بلین بەلی
عومەری عادل پیرە ژنی هەلسا
رەخنەیی لێ گرت بو رەخنەی ویستا

ووتی ئاخ عومەر ئەو پیرە دایە
زاناتر دەر چو لەو بیرو رایە
ئیسلام هەمو دەم ئەبی بەرز بیت
بەریوەبەری هەمو ئەرز بیت
هەر وەکو پیشان لە گشت روی زەمین
حوکمی قورئان بو رژیمی ئایین
نەوەك وەك ئیستا لە دەس ئیستیعمار
دلمان پر ژانە سەرمان پر ئازار
چونکو دور کەوتین لە یاسای قورئان
کەوتینە ژیر دەست کافرو جولەکان
وامان لی هاتووە خومان نا ناسین
ویلو سەر کەردان لاتو کەساسین
ئەوەیە سزای لادان لە ئایین
لە دونیاو ، ئەبی لە ئەو لاش چون بین
ئەبی هەول دەین دەرچین لەری‌ی شەر
بێینەوە سەرری‌ی خوداو پەیغەمبەر
خوایە دەرمان خەی لە دەست دوژمنان
بمان خەوە سەر رێی دینو قورئان

## کوتایی : باسی خویندنو خویندەوار ئەکات

گیانە بخوینە خویندن گەوهەرە
مروی خویندە وار زور بەهرە وەرە

خویندن رەوشـەنیو خویندن رابەرە

خویندن یارتـە خویـنـــدن یـاومرە

خویندن دوسـتیکە لیت نابی جیـــا

خویندنـە گەدا ئەکـاتن بە شـــا

بە خویندن ئەگـەی بە ناســـینی خوا

هەر بـەو ئەناســـریت رەواو نارەوا

خویندن دورڕیکە بێ پـــارەو پولـە

خویندن روناکی گشت تـارو چولـە

مروی نە خویندو هــەر وەك کورەیـە

گەر سـەد چاوی بیت هەرگیز کورەیە

نەك کورەی ریگا کورەی راســــــتی

ریگەیی دادو هـەم داد پـەرســـــتی

گەر خویندەواری پاش مردن زینـدوی

ئەگەر نا مردوی هەر چەند کە زیندوی

گەر خـاوەن مـالو زیـرو زەبـەر بی

کاتی کـە مردی گشـــتی گـوم ئەبی

کەس ناوت نـا بـا کەس نالی کـاکـا

ئیـتر مروێ وەهـــا بـو کـاکــــە

ئـەگـەر زانــــا بی نـاوت ئـەمینی

لە سـەر دەمو زار لـە ســـەر زەمینی

هەر چی ئـەبینی کـە نـاوی مــاوە

بـە هـوی زانینی مــاوە ئەو نـاوە

غەزالی کوری جوتیاری بو
به هۆی خوێندنی شەهسواری بو
ئەبو حەنیفە باوکی نوکەر بو
چون به هۆی خوێندن خاوەن ئەفسەر بو
شافیعی یەتیم کوری بیوەژن
بە هۆی خویندنی چلون بو مەزن
دەر واتی فکره لە دونیا گیانە
هەر خویندەواره به ریزو شانە
ئەوەندە بەسە بو ژیرو دانا
بویه لەقسە پێ‌نوسم دانا

## پەسند کردنی هەمو خویندنیك

هەر چی خویندنە باش‌و پەسندە
پر سودو کەلکە بو ئازاو بەندە
هەمو خویندنیك پیویستە بو گەل
نابی لە هیچ شت کومەڵ بی ماتەل
نابی موحتاج بی گەل بە بیگانە
له هیچ شتیکی پی‌ویستی ژیانە
گەر نا ناتوانی ئازاد ببی گەل
تاکو بو هیچ شت هیچ نەبی ماتەل
تا بو هەمو شت فابریکەی نەبی
ئیتر ئومیدی بەرزیت پی نەبی

ئەمە فەرمودەی دینو قورئانە
قورئان بخوێنە باشی بزانە
فێر ببە مانای چەندی ئەتوانی
خو تەواو نابیت مانای قورئانی
ئەو جا ئەزانی ئایین چی ئەکا
چۆن دوشمنایی ڕێی پەستی ئەکا
چۆن هانمان ئەدا بو ئیشو کردار
بو خۆ دەرخستن لە دەستی زور دار
ئەفەرموی پیمان جستو جو بکەن
ژینی دو دونیا پوختو کو بکەن
لە بەر دینو قەت دونیا جی میلن
لە بو دونیاشو دین بەجێ میلن
بو هەر دو ئیش کەن بەبی تەمبەلی
گەر وابی ئیتر پیاو چاکو وەلی
هەر لە قورئانیش وەکرە رەوشتت
بە گویرەی قورئان ریك خە سروشتت
چاك لە گوی بگرە گشت ئاموژگاری
پەندو نەسحەتو ئیشو بریاری
خۆ خوی پەیغەمبەر وێنەی قورئان بو
بویە زاتیکی وا عالی شان بو
لە پاش قورئانیش فەرمودەی رەسول
وەك فەرمودەی خوا ئەکریتن قەبول

ریگەیی راســـعیت ئەداتن نیشـــان

بــەرزت ئەكـــاتن لـــە هەردو ژیـــان

لە خویندنی قورئـــان پشت وەر نەگیری

پشت کەی لە قورئان لە قیامەت کویری[1]

تبــارك الملك بخوینــە گشت شـــــەو

گورت ئەكـــاتن ڕونـــاكو پڕ تـــەو

لـــە ئـــازاری گـــور رزگـــارت ئەكات

قســـەی پەیغەمبەر وا موژدە ئـــەدات

ســـورەی واقیمەش گشـــت شەو بخوینی

تـــەنـــگی لـــــە روزیو ڕزقت نـــابینی

ســـــودی قورئانی بو هـــەردو ژیـــــان

زورە ناکریتن لـــەو نـــامـــە بەیـــان

ئەوەندەم نوســـــــی تـــا بکەی بڕوا

قورئـــان پر ســـــودە بو هەر دو ودنیـــا

خوایە بن خە ســـــەر رەوشتی قورئان

ڕێگەی راستیمان بو بکەی ئاســـــان

هـــەم ژینی خوشـــی ببەخشـــــە پیمان

لە رۆژی ســـەزاش خوش ببـــە لێمان

---

(١) ئەروانی بو ئەم ئایەتە « ومن أعرض عن ذكري فان له معيشة ضنكا ونحشره يوم القيامة أعمى »

[ دانەر ]

برژینــــــه درود هــەردەم وەك بـــاران
ســـەر خوشەویستت موستەفا دیاران

سوپاس هەر بۆ تۆ هەر توی پشـــــتیوان
ئەو نامـــەم نوسی بو گشـــت موســـلمان

ســــــــــودی لێ وەرگرن پەیرەوی بکەن
تاکـــو بـــە خوشی هـــەر دوو ژین بگەن

ئتر بمبـــــورن خواتـــان بێ لـــەگـــەڵ
هیچ کەسی نیـــە بێ چەوتو بێ هـــــەل

جـگه لــــــە خـــودا زاتی بێ وێنـــە
هـــەم شـــاهی شاری مەککەو مەدینه

بـــە سوپاسی خـــوا درودو ســـــەلام
کوتاییی ئەینم هـــەم نامـــەم تـــەمـــام

سالی نەوەدو شەش پاشی سێسەد
له پاشی هەزار لـــە کۆچی ئەحمەد

بەم دو شیعرەی خوارەوە سوپاسی کاك حســـن حمه ئەمین ئەکەم دانیشتوی سلێمانی گەڕەکی مەڵکەندی ، کە ئەم نامـــەی بۆ پاك نوس کردم ٠

کاك حەســەن گەلێك سوپاســت ئەکەم
بۆ هەر دو دونیــا دوعــات بۆ ئەکــەم
یا خوا تەنگت نەبێ قــەت دڵت گیــانــە
نەیەتە پێشــــت کۆســپە لــە ژیــانــا

٢٨ ـ ذي القعدة ـ ١٣٩٦هـ

دانــەر

**محمد باليســاني**

امام وخطیب جامع حسن البارح

بغداد ـ سبع أبكار




رقم الايداع في المكتبة الوطنية ببغداد ١٠٧٧ لسنة ١٩٧٧